دیوانی عەونی
* چاپی یەکەم سالّی ١٩٩٧ ـ هەولێر
* وێنەی بەرگ : گرفتار کاکەیی
* خۆشنووسی بەرگ: زادە
* پیت لیدانی: سلێمان ئاژگەیی
* هونەرکاری: شکار نەقشەبەندی
* تیراژ: ١٠٠٠ دانە

# پێڕست

# پێشەکی

خوێنەری بەڕێز، هەر کەسێکی مێژووی ئەم چەند سەدەیەی دوایی شاری کۆیە بخوێنێتەوەو، لەباری کۆمەڵایەتی و ڕۆشنبیریی ئەو مەڵبەندە زیندووەی ئەدەب و هونەری کوردستانی باشوور ورد بێتەوە، بۆی دەردەکەوێ کۆیە شاری ئەدەبیات و جەرگەی هەست و نەستی نەتەوایەتی و خەباتی نیشتمانیی کورد و شوێنێکی ستراتیژی بازرگانی نێوانی شارە گەورەکانی کوردستانی خواروو و کوردستانی ڕۆژهەڵات بووە.

شارێکی گەلێک بەهات وبات و زیندوو بووە، بەتایبەتی لەسەدەی نۆزدەمەوە بەدەیان کەسی کۆمەڵایەتی ناودارو شاعیری مەزنی وەکو قاصیدو حاجی قادری کۆیی و ئەمین ئاغای ئەختەرو کەیفی و حاجی مەلا عەبدوڵلای جەلی زادە و حەزینە و نیهانی و مەنفی و مەلای گەورەو حوسەینی لێ هەڵکەوتووەو، لە بواری شیعرو ئەدەبیات و هونەر پەنجەی لە پەنجەی شارە مەزنەکانی دیکەی کوردستان داوەو، ئەو شاعیرانەش دەورێکی پێشڕەوانەو باڵایان لە هۆشیار کردنەوەو ڕۆشنبیرکردنی میللەتی کورددا گێڕاوە.

ئەگەر سەدەی نۆزدەم ئەو شاعیرە گەورەو ناودارانەی بۆ پەروەردە کردبین، ئەوا ئەم سەدەیەشمان، گەلێک شاعیری بەهرەداری هۆشیار و لێ هاتووی دیکەی وەکو عاصی و دلاوەر و زەکی هەناری و سامی عەوداڵ و ڕۆستەم و عەونی و مەیلی و دڵدار و دڵزارو دەستەیەک لە شاعیری بەهرەداری دیکەی لێ پەروەردە بووەو هەر یەکەیان دەوری شیاوی خۆی لە مەیدانی شیعری کوردی و خزمەتگوزاریی نەتەوەی کورد بینیوە.

عەونی لەناو ئەو دەستە شاعیرە لێ هاتووەی کورد وەک شاعیرێکی بەتوانای کاروانی شیعری دڵداری و نیشتمان پەروەریی لە ناوەڕاستی سی یەکانەوە تاکو ڕۆژی کۆچی دوایی کردنی لە ٢٠ی تەمووزی ١٩٩٢دا دەورێکی دیاری لەو کاروانە ئەدەبی یەی کوردیدا نواندو، هۆنراوەی بەپێزو جوان و ناسکی لە غەزەلی کوردی و شیعری کوردایەتی پێشکەش بەنەتەوەی کورد کرد و جێ یەکی بەرزی لەناو دڵ ودەروونی ڕۆڵەکانی میللەتەکەی بۆ خۆی کردەوە و ناوی شیرینی و هۆنراوە پڕ سۆزەکانی تا هەتایە بە نەمریی لەسەر رووپەڕی مێژووی ئەدەبی کوردی مانەوە.

عەونی شاعیری کورد:ـ

عەونی لەسەرەتای سییەکانەوە وەک شاگردێکی قوتابخانە شیعری یەکەی نالی و، وەک شاعیرێکی هەست ناسکی ڕێبازە نەتەوەییەکەی حاجی قادری کۆیی سەری هەڵداو لە ساڵی (١٩٣٥)ەوە دەست وبازووی شاعیرێتی بەتەواوی بەهێزبوو، هۆنراوەی پتەوی بڵاوکردەوە، بەتایبەتی دوای ئەوەی کە لە حوجرەی مزگەوتەکانی کۆیە، لەلای مەلاو موستەعیدەکان و شاعیرەکانی ئەو سەردەمەی وەکو حوسەینی و صافی و مەلا محەمەدی دلاوەر و عاصی چاوی بە هۆنراوە دەسنووسەکانی شاعیری مەزنی کورد (نالی) دەکەوت و، لەبەری دەکردن و هەوڵی دەدا هۆنراوی لە ئاستی ئەوانە دابنێ. لە دواییشدا لە(کۆمەڵە شیعرەکەی حاجی قادری کۆیی) ی ساڵی ١٩٢٥ی ئاورەحمان سەعید، ئاشنای شیعرە نیشتمانییەکانی ئەو کەڵە شاعیرە کوردە

کەریم شارەزا

بوو و، کەوتە سەر شیعری نەتەوەیی و نیشتمانیی دانان.
بەم جۆرە دەبینین عەونی شاعیری بەهرەدارمان کەوتە بەر کاریگەریی هۆنراوەکانی ئەو دوو شاعیرە مەزنەی کورد نالی و حاجی و ڕێبازێکی دوو ڕێچکەیی گرتە بەر، لە غەزەلدا قوتابییەکی زیرەکی نالی بوو، هەردەم بەدوای وردەکاری ڕەوانبێژیی و شیعری پتەودا دەگەڕاو، لەشیعری نیشتمانیشدا شاگردێکی هوشیاری ڕێبازە نەتەوەییەکەی حاجی قادر بوو و، بەدوای هەست و سۆزی کوردایەتیدا وێڵ بوو، هەردوو ڕێچکەکەی وەکو دوو هێڵی تەریبی گرتەبەرو سەرکەوتن و داهێنانی لە هەردوو جۆر وەدەست هێناون و هۆنراوەی جوان و پتەوی پێشکەش بە شیعر دۆستانی نەتەوەکەی کرد.
عەونی و شیعری دڵداری:ـ
وەک لەمەو بەر گوتمان عەونی لەسەرەتای شاعیرێتیدا پتر پەیڕەوی شیعرە نایابەکانی نالی دەکرد و هەر غەزەلەکانی ئەو کەڵە شاعیرەش بوون بەرەو جیهانی شیعریان ڕاکێش کردوو، بۆ وەڕاست گەڕانی ئەم ڕایەشمان با کەمێک لەم هۆنراوە کۆنەی ورد ببینەوە، تاکو بزانین تا چ ڕادەیەک گەوهەری وردەکاریی لەدەریای شیعرەکانی ئەو شاعیرە مەزنەی کورد هەڵێنجاوە و چۆن وەستایانە لە غەزالەکانیدا بەکاری هێناون، هەروەک دەڵێ:ـ

**لەم کوڵبەیی ئەحزانە عەشقی صەنەمێکم بوو**
**لەم چۆڵ و بیابانە، باخی ئیرەمێکم بوو**
**ئەی دڵ بەختەتا تاکەی مایل بەختەتاکاریی؟**
**دوێنێکە دەمێکم بوو، ئەمڕۆ نەدەمێکم بوو!!**

ئەگەر بەکەمێک ورد بوونەوە سەیری دێڕی دووەمی شیعرەکەی شاعیرمان بکەین، دەبینین بە ئاشکرا تارمایی شاعیریەتی نالی بەسەرەوەیە، هەروەکو ئەو دەیەوێ یاری بە وشەی شیعریی یەوە بکات و وردەکاریی ڕەوانبێژیی بنوێنێ، هەروەک لە نێوانی وشەکانی (دەمێکم) و(نەدەمێکم)دا کردوویەتی و جۆرە ڕەگەز دۆزیی یەکی پێکەوە ناوە و چونکە وشەی (دەمێکم) مانای (کاتێکم) یا(سەردەمێکم) دەدات و وشەی (نەدەمێکم)یش بە مانای پەشیمانی دێت و خۆی لەم تاکە دێڕە شیعرەی نالی نزیک دەکاتەوە کە دەڵێ:ـ

**دوێنێ چ بوو دەت دا بەزوبان لافی کەرامەت**
**ئەمڕۆ نەدەمت بوو، نەدەمت بوو، نەدەمت بوو!**

وشە ئارایییەکەی نالی لە وشەکانی (نەدەم) و(دەم)دا دەردەکەوێ کە (نەدەم)ی یەکەم بە مانای پەشیمانی و (دەم)ی دووەم بە لابردنی ئامرازی نەرێ ی(نە) بەمانای دەمی قسە کردن و (دەم)ی سێ یەمیش بەمانای هەناسە دێت(١).
عەونی دوای ئەم سەرەتایە سەرکەوتووەی هۆنراوەکەی لەسەر هەمان تام و بۆی شیعرە پڕ وردە کارییەکەی نالی چەند دێڕێکی دیکەمان پێشکەش دەکات و دەڵێ:ـ

**بێ هەمدەم و هەمتا مام بۆ خلوەتی تەنیایی**
**بۆ مونیس و ئەحزانی گوڵ غونچە دەمێکم بوو**
**ئاخیر فەلەکی بەدکار دووچاری غەمی کردم،**
**جاری لە خەوا وەصڵی لەب، جامی جەمێکم بوو**

دەبینین عەونی شاعیری لێ هاتوومان، نالی ئاسا وردەکاریی ڕەوانبێژیی لە وشەکانی (دەم)و (جەم)ی (دەمێکم) و(جەمێکم)دا دەکات و هونەرێکی جوان پێکەوە دەنێ.
ئەگەر بە دوای تارمایی شیعری شاعیری دیکەی کورد لە هۆنراوەکانی عەونی دا بگەڕێین، ئەوا دەتوانین تارمایی یەکی سووکی شیعرێکی مەحوی لەم نموونە شیعرەیدا دەسنیشان بکەین کە دەڵێ:ـ

**هەر دەڕۆین و پێ ناگەین**
**هەر دەڵێین و تێ ناگەین**

هەست دەکەین ئەم دێڕە شیعرەی عەونی کە لە هۆنراوەیەکی درێژدا قرتێنراوە، تارمایی ئەم دێڕە شیعرەی مەحوی بەسەرەوەیە کە دەڵێ:ـ

**هەر گفتوگۆمە، کەچی هەر دەڵێم وتێ ناگەم،**

**هەر جوست و جۆمە، کەچی هەر دەڕۆم و پێ ناگەم(٢)**

ئەمانە خستمانە ڕوو نموونەی شیعری شیعری سەرەتای شیعردانانی شاعیر بوون، هەوڵدانێک بوون بە دوای دەنگی تایبەتی پەیدا کردن و، لە ئەنجامدا ئەو دەنگەی بۆ خۆی خولقاندووەو، بووەتە شاعیرێکی بە دەستەڵات و توانا.

بەڵام لەیەکەم هەنگاویدا هەندێ جار وشەی ناوچەیی بەکار هێناوەو بە تەواوەتی خۆی بەزمانی ئەدەبی یەکگرتووی قوتابخانە شیعرییەکەی نالی نەبەستۆتەوە. بۆ نموونە: لە هۆنراوەیەکیدا بەناوی (هات فەسڵی گوڵان) ئەمەی کردووە و چووە وشەی (کێ)ی ئامرازی پرسیار بۆ دیارخستنی شوێنی لە جیاتی وشەی (کوێ)ی بەکار هێناوەو دەڵێ:-

**هات فەسڵی گوڵان، بولبولی دێوانە لەکێ یە؟**

**شەو ڕۆیی ئەدی عاشقی جانانە لە کێ یە؟**

**مەستم بەهەوای عەنبەری دوو زوڵفی سیاهت**

**بۆیی سەمەن و سونبول و ڕەیحانە لە کێ یە؟!**

ئەگەر لە جیاتی (کێ یە) وشەی (کوێ یە) دابنێین مانای شیعرەکان جوانترو تەواتر دەردەکەوێ، بەڵام لەلایەنی مۆسیقایی کێشی شیعرەکانەوە تارمایی جۆرە گرانییەکی بۆ پەیدا دەکات و، هەرچەند شاعیر وەک خۆی دەی درکاند هەر وشەی (کێ)ی پێ سووکتر بووە لە چاو (کوێ). بەڵام دەبوایە شیعرەکانی وا داڕشتبایە کە (کوێ یە) ببوایە سەروا، چونکە بۆ پرسیار کردنە لە شوێن نەک کەس!

دوای ئەو قۆناغەی شاعیری یەتی، شاعیری بەهرەدارمان دەست و بازووی داهێنانی شیعری باش بەهێز دەبێ و دەکەوێتە سەر هۆنینەوەی شیعری پتەویدا، کە وردە وردە لە دەنگی نالی دوور بکەوێتەوە و دەنگی ڕەسەنی خۆی بە شێوەیەکی هونەریی دەربڕێ و لەوشەی ناوچەیی خۆی لابدات و لە فەرهەنگی وشەی زمانی ئەدەبی یەکگرتووی کرمانجی خواروو کەرەستەی جوان و ڕازاوە هەڵ دەهێنجێ، هەروەک لەمەودوا بۆمان دەردەکەوێ. شاعیر لە هۆنراوەیەکی دڵداریدا دەڵێ:-

**وەرە مەی گێڕ ئەتۆ بۆم تێکە کەم کەم**

**مەزەی مەستی منی ماچێکی دەم دەم**

**بەچاوی تۆ ئەگەر تۆم ئاشنا بی**

**لەگەڵ خەم ئاشنا نابم هەتا هەم**

**لە پەروانە ئەمن زووتر دەسووتێم،**

**بەراورد ناکرێ ڕووی تۆ لەگەڵ شەم!**

بەم جۆرە شاعیری لێ هاتوومان هۆنراوە پتەوەکەی دادەڕێژێ و لە کۆتاییدا دەڵێ:-

**لەئاسک سڵترە ئەم شۆخە (عەونی)**

**دڵم نایە، دڵی بشکێ بە ئاستەم!!**

شاعیر لە هۆنراوەیەکی دڵداری دیکەیدا بە جۆرێکی نوێ لە زوڵفی یارەکەیەوە دەدوێ، کە چۆن جاران درێژو بەلوول بوو، کەچی ئێستاکە لەبەر مۆدەی سەردەم هەڵپاچرا و لەم بارەیەوە دەڵێ:-

**جاری جاران پرچ و زوڵفی دولبەران**

**وەک حەشارگەو لانەیەک بوون بۆ دڵان**

**گەربتۆرێت دڵ پەنا بۆ کوێ ببات**

**ئێستە پرچی لوول نەمان هەڵپاچران!**

ئنجا شاعیر دەیەوێ ئەو دڵەی لە گوڵزاردا نیشتەجێ ببێ و بۆ خۆی لانەیەک لەسەر چڵ و پۆپی گوڵان دروست بکات و، وەک بولبل لەباغان شیوەن بکات و بزانێ کچی شۆخی ڕوومەت گوڵ بەرامبەری دڵ ڕەقن و دەڵێ:-

**با لەگوڵزارێ ببێتە نیشتەجێ**

**لانەیەک سازکا لەسەر پۆپی چڵان**

**بولبول ئاسا با بکا شیوەن لە باخ**

**بابزانێ دڵ ڕەقن ڕوومەت گوڵان**

لە هۆنراوەیەکی دڵداری دیکەیدا بە هەمان کێشی ١١ بڕگەیی و دەربڕینی سادەو ناسک، بەناو نیشانی (وەکو قومری) وێنەی شیعریی جوان ورازاوەمان پێشکەش دەکات و دەڵێ:ـ

**وەکو قومری لەباخ و جۆیباران**
**لەبۆ سەروی قەددی شاهی نیگاران**
**دەڕێژم ئەشکی چاوم عەینی باران**
**دەناڵێنم لە عەشقی گوڵ عوزاران**
**وەکو بولبول لە چڵ فەسلی بەهاران**

دوای ئەم سەرەتا سەرکەوتووەی هۆنراوەکەی، شاعیر بەردەوام دەبێ لەسەر دەربڕینی باری گرفتاری لە پێناوی بەژن و باڵاسەرو ـ ینەکەی ئەو یارە شۆخەی و لە پێنج خشتەکی یەکی دیکەیدا دەڵێ:ـ

**بەدیەن ڕووت و بێ کەس وەک هەتیوم**
**وەکو پیرێکی سەد ساڵە ڕزیوم**
**هەتا مردن دەبێ هەر قوڕ بپیوم**
**لەژێر باری خەمت من چۆن چەمیوم**
**بەگەنجی چوومە ڕیزی دەست بەداران!!**

شاعیر بەری عەشقی پاکی بۆ کچێکی مەهابادی کە لەساڵانی سی یەکاندا ماڵیان لە کۆیە بووە و، نموونەیەکی بەرزی جوانی و شۆخ و شەنگی کچی کورد بووە، هۆنراوەیەکی ناسک ونایابی دڵداریی بۆ دادەنێ و، مێژووی دانانی شیعرەکەیش دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی ١٩٣٧ وبەم جۆرە دەست پێ دەکات و دەڵێ:ـ

**لەبەر جەوری کەسێکی کۆیی بێزار بووم بەبێ دادی**
**فەلەک خستمیە بەردەست چاو جوانێکی مەهابادی!!**
**کە لێی دام غەمزەیێکی خستمی هەستام وەهام گوت پێ ی**
**کچی کورد ئافەرین بۆ تۆ کە چالاکی لە صەیادی**
**گوتی: هەرکەس کە کەوتە بەندوداوی پەرچەمی خاوم**
**مەحاڵە بەربێ نابێ بکا قەت بیری ئازادی!**

هەر ڕەخنەگرو شیعرناسێکی کورد لەم چەند دێرە شیعرەی عەونی ورد بێتەوە، هەست بە جۆرە نوێ کردنەوەیەکی غەزەلی کوردی دەکات، ئەوەیش لە جۆری دەربڕینی وشەکان و تێکەڵاو کردنی وشەو دەربڕینی نەتەوەیی وەکو (کورد)و(مەهاباد)و (کوردستان) یاخود وشەی سیاسی وەکو (ئازادی) و بە وشەو دەربڕینی عەشق ودڵداری لاوێک بەرامبەر بە کچێکی شۆخ و شەنگی کوردو، شاعیری شیعر ناسکمان لەدوای ئەم دەست پێکردنە جوان و سەرکەوتووە دا لەسەر هۆنراوەکەی بەردەوام دەبێ و دەڵێ:ـ

**لە کوردستان نەبوو سیحروتەلیسم وجادوویی و ئەفسوونی،**
**لەکوێ فێر بوویی شۆخی و دولبەریی واهێندە ئوستادی؟!**
**بە شێوەی شیرنی زنجیرەی عەشقی خۆی لە مل کردم**
**منیش وا لێ براوم بێنمە دی ئاکامی فەرهادی!!**

هەر کەسێکی ئەم هۆنراوەیەی عەونی بخوێنێتەوە، جگە لە هەستی ئەڤینی کوڕێکی لاو بۆ کچێکی کوردی شۆخ و شەنگی مەهابادی هەست بە جۆرە سۆزێکی نیشتمانی و نەتەوەیش دەکات، ئەمەیش دیاردەیەکی شیعری نوێ یەو، شاعیرە هاوچەرخەکان بایەخێکی زۆری پێ دەدەن و بە هیچ جۆرێک خۆشەویستی ئافرەت لە خۆشەویستی کەل و نیشتمانەکەیان جودا ناکەنەوەو، بەیەک مەسەلەی دەزانن.

عەونی نەک هەر لەم هۆنراوەیەیدا جۆشی ئەڤین و هەستی نەتەوایەتی تێکەڵ بە یەکتری دەکات و ناوەڕۆکی شیعرەکانی پێ دەکاتە ناوەڕۆکێکی تازەو دەیان خاتە ناو چوارچێوەی شیعری نوێی ئەم سەردەمەمان، بەڵکو لە گەلێک شیعری دڵداریی دیکەیشیدا ئەم کارە دەکات بە بەرنامەیەکی هونەریی دیاری کراو بۆ شیعرەکانی. هەروەک لە هۆنراوەیەکیدا بە ناو

نیشانی (جیهانم پشکنیوه) ئەمەی کردووە و دەڵێ:-

**جیهانم پشکنیوه**
**نازدار جوانم زۆر دیوه**
**بەڵام وەک تۆ نازەنین**
**نەم دی لەسەر ڕووی زەمین**
**نەگوڵی نە هوزاری**
**جوان و شیرین ڕەفتاری!!**

لەدوای ئەم سەرەتایە و دەسنیشان کردنی ئەدگاری جوانی یارەکەی مەسەلەی خۆشەویستی ئافرەت و نیشتمانەکەی دەکاتەوە بەیەک مەسەلەو، ڕوو دەکاتە کچە شۆخەکەو پێی دەڵێ:-

**کیژێ تۆم دی وام زانی،**
**تۆ کچی کوردستانی**
**ئەگەر ئەوی بەڕاستی**
**ڕزگار دەبم لە پەستی**
**نازدارەی ماه ڕوخسار**
**ئەوەی بیست هاتە گوفتار**
**لەسەرەتا تا ئەنجام**
**وەهای پێ ووتم وەرام:**

ئنجا شاعیر خۆی لە سۆزی دڵداریی ئافرەت دەکێشێتەوەو، دەکەوێتە بواری دەربڕینی هەست و سۆزی نیشتمانی وتێکۆشانی ڕۆڵەکانی نەتەوەی کورد لە پێناوی ئامانجێکی دیاری کراودا، کە لە یەکگرتنەوەی ڕیزەکانی ڕۆڵەکانی گەلەکەیەتی و لە کۆتاییدا واقیعێکی تاڵ و ئەنجامێکی ڕەش بینانەمان بۆ دەسنیشان دەکات و دەڵێ:-

**من گۆران و تۆ کرمانج**
**هەردوو بە شوێن یەک ئامانج**
**هەر دەڕۆین و پێ ناگەین**
**هەر دەڵێین و تێ ناگەین**
**شێوەی ئەم گفتوگۆیە**
**لاوی کورد ڕەنجەڕۆیە !!**
**نەلەیەک دەگەین**
**نەبەیەک دەگەین!!**

ئێمە لێرەدا دەوەستین و بە چاوێکی ڕەخنەگرانە سەیری سێ دێرە شیعرەکەی دوایی دەکەین و دەڵێین:

ئەگەر لەیەک نەگەیشتین و بەیەک نەگەیشتنی کورد تا ئەم دوایی یەش واقیعێکی تاڵ بووبێ، بەڵام ئایا مەرجە تا سەر هەروابێ ونەگۆڕێ؟!

نابێ مرۆڤ وا ڕەش بینانە سەیری دوا ڕۆژی میللەتەکەی بکات، چونکە گەل و نەتەوە تاکە کەسێک یا دەستەیەک نین تا نا ئومێد ببێت بەڵکو هێزێکی گەورەی لەبن نەهاتووی داهێنەرن و هەر بەرەو پێشەوە دەچن، ڕۆژێک هەر دادی ڕۆڵەکانیان لەیەک تێ بگەن و یەک بگرنەوە.

عەونی و شیعری کوردایەتی:-

عەونی لە سەرەتای شاعیریەتیدا بە شیعری دڵداری چووە ناو دنیای ئەدەبیات، بەڵام زۆری پێ نەچوو هەستی پڕ جۆششی نەتەوایەتی پاڵی پێوەنا، لە دەرگای شیعری نەتەوەیی ونیشتمانیش بدات. بەتایبەتی لەوکاتەی کە کوردستان لە هەر چوار لاوە، لە تورکیاو ئێران و عێراق و سوریە، لەناوەڕاستی بیستەکان و سەرەتای سییەکانەوە کەوتبووە بەر شاڵاوی چەوساندنەوەی نەتەوەیی و، شۆڕشەکانی کورد لە هەموو لایەک بە ئاگر و ئاسن دادەمرکێنرانەوەو، ڕۆڵەکانی لەناو دەبران و دەر بەدەر دەکران و بەکار تێکردنی ئەو ڕووداوە جەرگ بڕانە، عەونی شاعیری دڵسۆزی نەتەوەکەی لە ناوەڕاستی سییەکان هۆنراوەیەکی بە ناونیشانی «ئەسلەحەی جەنگی دەبەستم» داناوەو لەسەرتاکەیدا دەڵێ:-

**ئەسلەحەی جەنگی دەبەستم پاسی کوردستان دەکەم**
**قەتلوعامی حاکمانی تورکیا وئێران دەکەم**
**من لە ڕێگای سەربەخۆیی خاک و ڕزگاری گەلم**
**گیانی خۆم و قەوم و خویشانم هەموو قوربان دەکەم**

شاعیر دوای ئەم سەرەتا گەرم گورەی هۆنراوەکەی کە دەیەوێ چەک لە دژی دوژمنانی کورد هەڵگرێ و تۆڵەی ڕۆڵە کوژراوەکانی نەتەوەکەی خۆی لە حوکمڕانەکانی تورکیاو ئێران بکاتەوە، بۆیە لە پێناوی سەربەخۆیی وڵاتەکەی گیانی خۆی و کەس وکاروخوێشەکانی دەکاتە قوربانی و دەکەوێتە بەڵگە هێنانەوە بۆ ئازایەتی و جەنگاوەریی نەتەوەکەی خۆی و، هەڕەشەش لەو لایەنانە دەکات کە خوێنی کوردیان ڕژاندووە و دەڵێ:ـ

**چیم بە ئاشوور کرد لەکاتی خۆی بەڵێن بێ هەروەها**
**تەخت وبەختی دوژمنانی کورد بەخاک یەکسان دەکەم**
**هەر کەسێک بێتو لەهەرلا خوێنی کوردی ڕشتبێ**
**خۆم بە شوێنیدا دەڕۆم خانەی بەسەر وێران دەکەم**

عەونی دیوانەکەی پڕە لە شیعری نیشتمان پەروەریی و نووکی خامەکەی لەگەڵ شکستی یەکانی بزووتنەوەی ڕزگاری خوازیی نەتەوەکەی شکستی نەهێناوە بەڵکو بە وردی لەو کارەساتانەوە دواوە وورەی نەوەی نوێی کوردی بەرز کردۆتەوە. هەروەک لەدوای لەناو بردنی کۆماری دیموکراتی کوردستانی ئێران و لەسێدارە دانی پێشەوای نەمری کورد قازی محەمەد، بڕوای بەوە هەبووە کە میللەتی کورد نامرێ و ڕۆژێکی دادێتەوە هەڵمەت بەرێتەوە سەر دوژمن و تۆڵەی لێ بسێنێتەوە و بە هیچ جۆرێک سێدارە کورد ناترسێنێ و هەر دەبێ گەلی زۆر لێکراو ئازاد بێ و لەهۆنراوەیەکیدا بەناوی (شینی پێشەوا) کە لەسەرەتای مانگی نیسانی ١٩٤٧دا داینراوە، واتە: چەند ڕۆژێک دوای لەسێدارە دانی پێشەوای کوردو کوژاندنەوەی گڕی ڕووناکی هیوای نەتەوەکەمان بە تێکدانی کۆمارە ساواکەی و بەدڵێکی سووتاوەوە دەڵێ:ـ

**لە سی مارتی چل و حەوتا**
**لەچەپ گەردی چەرخی چەوتا**
**لە مهاباد لە چوار چرا**
**داری بێ دادی هەڵکرا!!**
**ئەو دارەی پێش نیوەی شەوا**
**وەستا لە ژێریا پێشەوا**
**گوتی: ئێستا دەڵێم: کوردم**
**لەڕێ ی ئازادی کورد مردم**

دوای ئەم سەرەتایە پڕ لە سۆزی دەروونی کوردە لە بەبیرهێنانەوەی کارەساتی کۆماری مەهاباد بەدەستی ڕژێمی کۆنە پەرستی ئێران لە ناو بردنی پێشەوای کورد، شاعیر دێ وەسفێکی وردی ئەو شەوە پڕ لە خەم و خەفەتەی کوردستان دەکات و دەڵێ:ـ

**شەوێکی پڕ تاسەو خەم بوو**
**لە کوردستانا ماتەم بوو،**
**شین بوو ڕۆ ڕۆ بوو فریاد بوو**
**بۆ پێشەوای مەهاباد بوو!**
**لە مێژووی کورد دا ئەو شەوە**
**هەتا ئەبەد ناسڕێتەوە!!**

شاعیر دوای ئەو کارەساتە جەرگ بڕەش ورە بەرنادات و هێزێکی گیانی بەبەر لاوانی نوێی نەتەوەکەی دا دەکات و دەڵێ:ـ

**کورد ناترسێنێ سێدارە،**
**کرداری دەستی زۆردارە!**
**هەر دەبێ زۆر دار کەساد بێ**
**زۆر لێ کراویش ئازاد بێ**

**کورد دەبێ بۆ خۆی هوشیار بێ**
**نابێ لەکەس هیوادار بێ**
**دەبێ زانا و هونەرمەند بێ**
**لەزانستا دەوڵەمەند بێ!**

عەونی شاعیری نەتەوەیی، ترووسکەی رووناکی هیوای دوا رۆژی گەلی کورد، لە هوشیاریی رۆڵەکانی و لە هونەرمەندیی لاوە تازە پێگەیشتووەکانی یەوە پیشانی نەوەی نوێی گەلەکەی خۆی دەدات، کە چۆن دەبێ لەم سەردەمەی ئێستا و لەدوا رۆژدا تەنیا پشت بە خۆیی و بەزانست و هونەری نوێ ببەستی، تاکو تاقی کردنەوەکەی مەهابادی لێ دووبارە نەبێتەوە.

عەونی شاعیری نیشتمان پەروەری کورد لە دوای کارەساتە دڵ تەزێنەکەی ساڵی ١٩٧٥ و پیلانە شوومەکەی جەزایر، هۆنراوەیەکی پڕ بەهای لە شیعری کوردایەتی داناوە و ئەو پیلانە بۆگەنە نێو دەوڵەتی یە ریسوا دەکات، کەچۆن ئەو چاڵەیان بۆ چارەنووسی شۆڕشی کورد هەڵکەند، هەر چەندە ماوەیەکی کەمیش بووبێ، هەرەسیان پێ هێناو هۆنراوەیەکی بەناوی «رۆژی رەش» داناوەو جارێکی دیکەش وانەی نەبەزین و خۆڕاگریی بۆ رۆڵەکانی نەتەوەی کوردمان دادەدات و لە بەشێکی هۆنراوە درێژەکەیدا دەڵێ:ـ

**گەر نەمردم بەم برینە**
**ئەمجا ئاکارم ببینە!!**
**بەکار دێنم بیرو هەستم**
**سروودێک وا هەڵدەبەستم**
**قارەمانی ناو سەنگەربێ**
**دوژمن کوژ و کۆڵنەدەربێ**
**مووشەکێکی تانک شکێن بێ**
**هێزێکی دوژمن بەزێن بێ**
**سروودێک ناوی تۆڵەبێ**
**دژی ئەم شایە زۆڵە بێ!!**

شاعیر لە تۆڵەی ئەو پیلانەی شای ئێران و (صدام حسین)ی عێراقی بەعس لە دژی کوردیان گێڕا، سروودێک دادەڕێژێ تاکو ببێتە قارەمانی ناو سەنگەری فیداکاریی و ببێتە مووشەک و هێزی دوژمن بشکێنێ و لەناوی ببات.

هەروەها شاعیری شیعری کوردایەتیمان لە ساڵی ١٩٧٩دا لەگەڵ بیستنی هەواڵی جەرگبڕی کۆچی دوایی سەرۆکی میللەتی کورد بارزانی نەمر، هۆنراوەیەکی شیوەنی بەناوی «کاوەی سەدەی بیستەم»ی بۆ دادەنێ و لە پارچەیەکیدا دەڵێ:ـ

**لە کوردستانی بەرین**
**کاوەی سەدەی بیستەمین**
**کاوەی نەمر بارزانی**
**ئالای خستە سەر شانی!**
**شۆڕشێکی بەر پاکرد**
**مافی کوردی داوا کرد**
**داوای مافی ڕەوامان**
**بۆمان نووسرا بە تاوان**

تاکو لە کۆتایی هۆنراوەکەیدا، بارزانی وکاوەی ئاسنگەر دەکاتە دوو قارەمان ودوو ڕەمزی مەزن و نەمر لەژیانی نەتەوەی کوردا دا و دەڵێ:ـ

**نامرن ئەو دوو ناوە،**
**یەک بارزانی، یەک کاوە!!**

شاعیر لە خەباتی بەردەوامی لە پێناوی کوردو کوردستاندا هەموو ئامانجێکی ئەوەبوو پارچەکانی کوردستانی دابەش کراو یەک بگرنەوەو هاتنە دی ئەم ئاواتە مەزنەی کورد و فیداکاریی رۆڵەکانیشی لە پێناویدا، لە هۆنراوەیەکی نەتەوەییدا بە ناوی «نامرێ ئەم گەلە»

دارشتووه و دەڵێ:-

**گەلێک هەمیشە لە تێکۆشان بێ**
**دروشمی یامەرگ یا کوردستان بێ**
**گڕی شۆڕشی ناکوژێتەوە**
**هێرشی دوژمن ئەگەر تۆفان بێ**
**مافی سروشتی خۆی دابین دەکا**
**گەلێ خەباتی کەبێ وچان بێ**
**ڕۆژێک دێت هەموو یەک دەگرێتەوە**
**بۆتان و سۆران، موکری وبابان بێ**

ئەگەر کەمێک لەم چەند دێڕە شیعرانەی شاعیری نەتەوەییمان ورد بینەوە، هەست بەسادەیی دەربڕینەکانی دەکەین، هۆی ئەمەیش دەگەڕێتەوە بۆ دارشتنە ڕاستە و خۆکەی ئەم جۆرە شیعرە سیاسییانەی، مەبەستیشی ئەوە بووە کاروانی تێکۆشانی خەباتگێڕانی نەتەوەی کورد بیکەن بە پەیڕەوو بەرنامەی خەباتی بێ وچانیان، بۆیە دروشمە سیاسییەکانی ئەو قۆناغەیان بۆ لەناو شیعرەکانیدا دەچەسپێنێ. هەرچەندە ئێستا ئەم جۆرە خستنە ڕووەی دروشمی نیشتمانی بەهاو نرخی جارانی نەماوە بەڵام بۆ ئەو سەردەمەی خەباتی گەلی کورد و هوشیار کردنەوەی لاوە خەباتگێڕەکانی کارێکی ئەدەبی زۆر پێویست بووە.

دوای ئەو قۆناغەی کە شیعری سیاسی بەدروشمی خەباتی بێ وچانی کورد ئاودرا، شاعیر وردە وردە دەکەوێتە سەر شیعری سیاسی پتەو دانان و خۆی لەو ڕاستەو خۆیی یە لادەدات و، دەچێ لەگەڵ بیروباوەڕی فەلسەفییانەی تێکەڵ دەکات و، نموونەی شیعری سیاسی پڕ هێزو وزەی داهێنانمان پێشکەش دەکات و هۆنراوەیەکی پتەویدا دەڵێ:-

**دوژمنی بەدکاری من هەرچی بکەی لێت ناگرم**
**بێت دەڵێم من تاکو ئێستا ماوم وقەت نامرم**
**هەرچی پێت دەکرێ لەگەڵ من بیکە هیچ سوودی نییە**
**ئەو پڕۆژەی خۆم مەبەستمە دەستی لێ هەڵناگرم**

لەوانەیە لەگەڵ خوێندنەوەی ئەم دوو دێڕە شیعرەی شاعیری لێ هاتووی خاباتگێڕمان، هەندێ کەس واتێ بگەن هۆنراوەکە سیاسی نییە و بۆ دوژمنێکی کۆمەڵایەتی و نەیارێکی خودی شاعیر گوتراوە، چونکە هیچ نیشانەیەکی ڕاستەو خۆی خەباتی سیاسی بەسەرەوە نییە. بەڵام بە کەمێک ورد بوونەوە بۆمان دەردەکەوێ کە شیعرێکی سیاسی ناڕاستە خۆیە و مەبەستیشی لە دوژمن، دوژمنی وڵات و نەتەوەکەیەتی چونکە لە دێڕی دووەمدا پێی دەڵێت:-

(ئەو پڕۆژە خۆم مەبەستمە دەستی لێ هەڵناگرم) مەبەستی پڕۆژەی خەبات و وەدەست هێنانی مافی نەتەوەکەیەتی و، لەم چەند دێڕەی دواییشدا پتر ئەم مەسەلەیەمان بۆ ڕوون دەکاتەوە و دەڵێ:-

**وەک هەڵۆ لانەم لەکێوێکی بڵند هەڵ بەستوە**
**چەندی بەردم تێ گرن تازە بەکەس هەڵ نافڕم**
**تێگەیشتم چەند هەڵەم کردو فریوم خواردبو**
**تۆبە بێ تۆبە ئیتر دەستی برای خۆم نابڕم**

شاعیر واقعی ژیان و تێکۆشانی میللەتەکەی دەردەبڕێ کە وەک هەڵۆیەک لانەی خۆی لەسەر کێوێکی بەرز بنیات ناوە کەمەبەستی لە کێوە سەرکەشەکانی کوردستانە، بۆیە وا خۆڕاگرە و بەکەس هەڵناقەنێ و لەدوا دێڕی هۆنراوەکەشدا ئاماژە بۆ فریو خواردنی پێشووی کورد دەکات کە چۆن بە قسەی دوژمن و فرفێڵی، دەستی برای هاونەتەوەیی خۆی بڕیوەو پەیمان دەدات کە لەو هەڵە زلانەی پێشووی تۆبە بکا.

شاعیر لە هەمان ڕێبازی شیعری سیاسی لە قالبی ڕەمز وهێمادا. هۆنراوەیەکی دیکەی بەناوی (گەشتی مانگە شەو) داناوە و لە ڕێبوارێکەوە دەدوێ کە ئاوارە و سەرگەردان بووەو چیا و چۆڵ و بنار و دۆڵ دەبڕی بەو هیوایەی بگاتە قۆناغ و، ڕێبوارەکە خەباتگێڕێکی کوردە و گەشتەکە گەشتی کاروانی خەباتە و ڕێبواری خەباتگێڕ تا لەدەستی دێت و هێزی بینین و توانای

ڕێگە بڕینی هەبێ تێدەکۆشێ و بەرەو پێشەوە دەڕوات و لەبەشێکی هۆنراوەکەیدا دەڵێ:-

**هەستام ورووم کردە چۆڵێک**
**کەوتمە داوێن هەردەو دۆڵێک**
**کەوتمە داوین کۆهسارێک،**
**ڕێم دەر نەکرد لە کنارێک**
**تا ماندوو بووم لە پێ کەوتم**
**هەورازێک بوو سەر نەکەوتم!**
**لەو کاتەدا مانگ ئاوا بوو**
**ڕێگەی دوورم لێ کۆتا بوو!!**

شاعیر ئەم بابەتە دەکاتە ڕەمزی تێکۆشان و پێ لەو ڕاستییەش دەنێ کە ڕێگەی کاروانی خەبات گەلێک هەورازو هەڵدێری ترسناکی لە پێشە، بۆیە لای نەنگ نییە گەر هەندێ جار بوەستێ. بەڵام شاعیری ئامانجی ئەو ڕێبوارە تێکۆشەرە بە هیوا دادەخات و دەڵێ:-

**دەبێ چاو لەڕێی کاروان بم**
**گوێ گری بانگی بەیان بم!!**

* عەونی لەسەر هەمان شێوەی شیعریی نەتەوەیی تێکەڵ کردن بەوەسفی سروشتی خاکی وڵاتەکەی و کێشە و بەربەرەکانی نێوان خونچە گوڵێک و بولبول دەکاتە بابەتی هۆنراوەیەکی بەناوی (خونچە گوڵێک) و مەسەلەی دڵداریی نێوانی گوڵ وبولبول بە جۆرێک هەڵ دەگێڕێتەوە کە خونچە گوڵی باخی کوردەواری نایەوێ خۆی بەدەستەوە بدات و هەر بولبولێک بۆی بخوێنێ لێوی خۆی بۆ بکاتەوە(٣) و بە بولبول دەڵێ:-

**گوتی: بولبول هەرزەکاری**
**لێت بوویتە خوو شین وزاری!**
**هەردەم لەسەر لقی چڵی**
**هەر ڕۆژ بەرامبەر بە گوڵێ**
**زۆر خۆت دەکەی ماندوو وشەقی**
**چڵێک لە ژێر پێت دەچەقی**
**من تا ئێستا پارێزراوم،**
**چڵی خۆمە دەوری داوم**

دوای ئەوەی شاعیر مایەی پارێزراوی (خونچە گوڵ) کە دەیکاتە ڕەمزی میللەتی کورد، دەباتەوە بۆ ئەو چڵەی کە هەیەتی و هەرچی دەستی بۆ درێژ بکات دەچێتە دەست و پێ و چاوی، ئنجا دەڵێ:

**نەتۆ، نە باغەوانی پیر**
**ناتوانن بمکەن دەستگیر!!**
**خونچەی باخی کوردەواریم**
**بەراتی مژدەی ڕزگاریم!!**

شاعیر لە هۆنراوەیەکی دیکەیدا بەناوی (نەورۆز و کەژاڵ) کە دوو کچی کورد دەنوێنن، نیشانەکانی نەورۆز و بەهار و بنەوشەیان بۆ دەسنیشان دەکات و، وەکو چەند ئینسانێکی کورد، نەک وەکو وشەی ئاسایی مامڵەتیان لەگەڵدا دەکات و جووڵەو دەوری شانۆیی یان بەسەر دابەش دەکات و دەڵێ:-

**نەورۆز و بەهار وەک جووتە خوشکان**
**لە شادی کڕین ئەمساڵ تێ شکان!**
**بەهار بنەوشەی لەزستان کڕی**
**کراسی جەژنی بۆ نەورۆز بڕی**
**بۆچی نەی زانی بنەوشەی سەر شین**
**بۆ شایی نایەو هەر دەیکا بەشین**
**ئەم کە پەروەردەی سەرمای زستانە**

**سەر کزە لۆکە و چاو بە گریانە**
**نەورۆز دەیەویست گوڵی زەردو سوور**
**شادی هێنەر بێ لە نزیک و دوور!**

دوای ئەم سەرەتایە جوان سەرکەوتووە، باوکی (کەژاڵ) دێتە وەڵام و دەڵێ: « ئەگەرچی نەورۆزی پار خۆش نەبوو، بەڵام من بەڵێن دەدەم بۆ جەژنی نەورۆزی ئەمساڵ جلی سەوزو سوور بۆ کەژاڵ بکڕم و بیڕازێنمەوە بۆ شایی و ئاهەنگی ئەو جەژنە نەتەوەیی یەمان و لەم هەنگاوەی هۆنراوەکەدا شاعیر دەڵێ:ـ

**ـ بەڵێن بێ منیش بۆ جەژنی ئەمساڵ**
**جلی سەوزو سوور بکەم بۆ کەژاڵ**
**بیڕازێنمەوە وەک بووکی بەهار،**
**وێنەی نەدی بێ چاوی ڕۆژگار!!**
**بچێ بۆ شایی بە شادمانی،**
**بە ئاوازی خۆش بڵێ گۆرانی**
**چ گۆرانی یەک؟ نەغمەی ئازادی،**
**دەنگ بداتەوە دژی بێ دادی!**

ئەوەی عەونی شاعیر هەست ناسک لەم هۆنراوەیەیدا کردوویەتی لاسایی کردنەوەی هیچ شاعیرێکی پێش خۆی نییە، بەڵکو داهێنانێکی نوێیەو، بەرهەمی ئەندێشەی قووڵ و سۆزی ناسکی کوردایەتی خۆیەتی و لەم هۆنراوەیەیدا دەری بڕیوە، تاکو لە کۆتاییدا، بە شێوەیەکی درامایی ودوای تۆڵە سەندنەوەی بەهاری خۆشەویستی لە زستانی ساردو سەخت، (کەژاڵ و نەورۆز) وەک دوو کچی جوان تێکۆشەری کورد، چەپکێک گوڵی سوور لە گوڵزاری کوردستان بکەن بەدیاریی سەرکەوتنی گەلەکەیان و هۆنراوەکەی بەم جۆرە و بەبێ بەکار هێنانی دروشمی زەق و ڕاستە و خۆی نیشتمانی و نەتەوەیی کۆتایی پێ دێنێ و دەڵێ:ـ

**بەهار لە زستان تۆڵە بستێنێ**
**پەیمانی سەهۆڵ بەندان بشکێنێ!**
**کەژاڵ ونەورۆز بەهاری کاری**
**چەپکێک گوڵی سوور بکەن بەدیاری**
**نەورۆز حەز دەکا گوڵ بۆ بەهار بێ**
**کەژاڵ دەیەوێ گەلی ڕزگار بێ!!**

شاعیر لەساڵی ١٩٨٥دا پاش ئەوەی باری بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی کورد بەهۆی ناکۆکی ناوخۆگەیشتە پێچپێکی زۆر سامناک، هۆنراوەیەکی پڕ پەندو ئامۆژگاریی نەتەوەیی بەناوی (یەکبوون) داناوەو تێیدا داوای یەکگرتنی ڕیزەکانی هێزە خەباتگێڕەکانی کورد دەکات و دەڵێ:ـ

**نۆش داروی دەردی گشت یەکبوونە دەیزانین هەموو**
**گەر هیوادار بم بەیەکبوون شوێن ئەم وئەو ناکەوم**
**ئاشنا گەر نەم کوژی ترسم نی یە نا ئاشنا**
**با هەمیشە گوللە بارانم بکا پێ ی ناکەوم**
**خۆشە نەمرم تاکو ڕۆژی خۆم بەسەربەستی دەدی**
**بشمرم باکم نی یە، ئەو ساکە شوێن سوێ ناکەوم**

عەونی و شیعری خەباتی گەلان:ـ

* عەونی شاعیری شیعری دڵداری و کوردایەتی، نەیدەویست بزووتنەوەی ڕزگاریخوازیی نەتەوەکەی لە کاروانی بزووتنەوەی ئازادی خوازیی گەلانی جیهان دابڕێ و بەبیرو باوەڕێکی مرۆڤایەتییانە سەیری تێکۆشان و شۆڕشی چەکدارانەی گەلێکی زۆر لێکراوی وەکو گەلی فەلەستینی کردووە کە چۆن لە دژی داگیرکەری وڵاتەکەی لەخەباتی شۆڕشگێڕیی دایەو، دەڵێ:ـ

**سڵاوی ئێمە لە کوردستانا**
**لەبەرزترین لووتکەی کێوانا**

**بۆ برای فیدایی لە فەلەستینا**
**لەناو خەباتی سەختی خوێنینا**
**خوا لەگەڵ هەقە و ئێوەش هەقدارن**
**چەوسێنراوەی دەستی زۆر دارن**

دوای بەستنەوەی تێکۆشانی گەلی کورد لە کوردستاندا بە خەباتی خوێنینی فیداکارانی فەلەستین، بەبیرو باوەڕ و پشت بەستن بەهەق. ئەوەمان دەخاتەوە یاد کە لەکاتی جەنگەکانی صەلاحەددینی ئەیووبی (١١٣٨ـ١١٩١ز) لە دژی خاچ پەرستەکان، چۆن خوێنی کوردو عەرەب لەشەڕی حوتین (١١٨٧ز) و شەڕەکانی دیکەی ئەو سەرکردە گەورەیەی کورد، تێکەڵاو بەیەکتر بوون بۆ ڕزگار کردنی شاری قودس و سەر پاکی وڵاتی فەلەستین و دەڵێ:ـ

**خۆ شەڕی صەلیب هەر لەبەر چاوە**
**لەزۆر شوێن ئێستاش ئاساری ماوە**
**وا پیشان دەدا مێژووی ڕابردوو**
**ڕژاو تێکەڵ بوو خوێنی من توو**
**کوردم من نەوەی صەلاحەددینم**
**برای بەوەفای عەهدی دێرینم**

شاعیر لەڕێگەی هەستی مرۆڤایەتییەوە، مێژووی تێکۆشانی نەتەوەی کوردو نەتەوەی عەرەب بەیەکەوە دەبەستێتەوە، ئێستاش ئامادەیی کورد نیشان دەدات بۆ پشتیوانی کردنی شۆڕشی فەلەستین چونکە برای بەوەفای پەیمانی سەردەمی صەلاحەددینن.

ئنجا دەڵێ: ئەی فیداکاری فەلەستین، نەک هەر، ئێمەی کورد بۆت بە پەرۆشین، بەڵکو هەموو ئازادی خوازانی جیهان پشتیوانی تۆن و دەڵێ:ـ

**برای فیدایی نەک هەر من تەنیا**
**بۆت بەپەرۆشم وەک باوک و برا**
**هەموو ئازادی خوازانی جیهان**
**پشتیوانی تۆن وەک من بێ گومان**

* عەونی نەیویستووە هەست وبیری شاعیریی هەر لەناو چوارچێوەی کوردستان و ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست بمێنێتەوە، بەڵکو ویستوویەتی ئەندێشەی دوورتر بڕوات، تابڕ دەکات هەر بڕوات، تا دەگاتە ئەو وڵاتانەی کە جولانەوەی ڕزگاریخوازییان تێدایە و لەدژی دوژمنی داگیرکەر دەجەنگن، دەیەوێ خەباتی گەلەکەی ئەڵقەیەک بێت لە ئەڵقەکانی جولانەوەی ڕزگاریخوازیی جیهانی سێ یەم و، هەر بەو نیازەوە لە ساڵی ١٩٦٩دا هۆنراوەیەکی شۆڕشگێڕیی بۆ «ڤێتنام»ی بە خوێن سوورکراوی دەستی داگیرکەر دادەنێ و بەبای شەماڵی چیاکانی کوردستان سڵاوی گەلی کوردسان بۆ دەنێرێ و دەڵێ:ـ

**شەماڵ فیدات بم وەک پەیکی ڕەوان**
**پڕۆ بەپەلە بەبێ پشوودان**
**بەرەو ڤێتنامی بە خوێن سوورکراو**
**بەرەو ڤێتنامی گڕ تێ بەر دراو**
**ئەوسا گەیشتی بەبێ ترس و لەرز**
**بچۆ بارەگای ڤیەتکۆنگی نەبەز**
**بڵێ: «ئەرکی ڕێ ی دوورم کێشاوە**
**سڵاوی گەلی کوردم هێناوە!!»**

دوای گەیاندنی سڵاوی گەلی کورد بە گەلی ڤێتنامی شۆڕشگێڕ ئەم دێڕە شیعرەیان وەک پەندێک یاخود قسەیەکی نەستەقی سیاسی بە بەرگوێی شۆڕشگێڕانی ڤێتنام هەڵ دەدات و دەڵێ:ـ

**تا بە خوێنی گەش سوور نەبێ وڵات**
**هەرگیز ئەو گەلە ناگا بە ئاوات**

لەکۆتایی هۆنراوەکەیدا مژدەی سەرکەوتن بە ڤێتنامی شۆڕشگێڕ دەگەیەنێ و، کۆتری ئاشتی

پیکاسۆ بە چڵی دار زەیتوونەوە مژدەی ئاسایش و هێمنانیی بە گەلی ڤیتنام و شکانی ئیمپریالیزم بە هەموو لایەکی جیهاندا ڕادەگەیەنێ و دەڵێ:ـ

**بڵێ: مژدەبێ زۆری نەماوە**
**زۆردار لە دەنگی گەلان ترساوە**
**چڵی زەیتوون و کۆتری بیکاسۆ**
**مژدەیی ئاشتی دەگەیەنن بە تۆ!!**

* عەونی وەک شاعیرێکی نەتەوەیی کورد لەمەڵبەندی خۆی و لەناو قاوغە تەسکەکەی شارە بچکۆلانەکەی کۆیە نەمایەوە. بەڵکو لە ئەنجامی ڕەنگدانەوەی هەڵوێستی سیاسی خۆی و ئەندێشەی قووڵی و بیری پێشکەوتن خوازو ڕووناکی، خۆی گەیاندە ژان و موعاناتی گەلان و ، بەشداریی لە ناخۆشیدا لەگەڵدا کردن و شیعری ناسکی بۆ گوتن ومژدەی سەرکەوتنی پێدان و ، دەرسێکی باشیشی بۆ ڕۆڵەکانی نەتەوەی کورد دادا، ئەویش ئەوەیە: دەبێ بە چەکی زانست و هونەر بێنە مەیدانی ژیان و، خەباتی گەلانی جیهان بە خەباتی خۆیان بزانن.(٤)

عەونی و پەیوەندی بە شاعیرانی دیکەی کوردەوە:

عەونی شاعیرێکی بەهرەمەندو هەڵکەوتووی کورد بوو، لە ناوەڕاستی سییەکانەوە، کانیاوی شیعری تەقیەوە و لە دنیای شیعرو شاعیراندا دەنگی خۆی چەسپاندو(٥) و، لەشاری کۆیە دەورێکی تایبەتی گێڕا و پەیوەندیی شاعیریی لەگەڵ دەستەیەکی باش لە شاعیرانی ئەو شارەو زۆر لای کوردستان بەستووە، لەوانە شاعیری ئوستادی غەزەلی کوردی صافی هیرانی و، مەلا سابیری مەیلی و دلزار و دڵداری شاعیری پێشکەوتنخوازی کورد و لە دواییشدا هێمنی مەهابادی ببوە دۆستێکی گیانی بە گیانی و دوور بە دووری شەیدای شیعرە ناسککانی بوو، بۆیە دەبینین گەلێک لە شیعرە ناودارەکانی کردووە بە پێنج خشتەکی، بۆیە ئێمە لێرەدا کەمێک لە پەیوەندیی ئەم شاعیرەمان بە شاعیریەتی دڵدار و هێمن دەدوێین:

* پەیوەندی بە دڵدارەوە:

عەونی لەناو شاعیرانی شارەکەی خۆی، لەگەڵ دڵداری شاعیری شیعر ناسک و خاوەنی سروودی نیشتمانی (ئەی ڕەقیب)دا پەیوەندییەکی پتەوی ئەدەبییان بووە و چەند هۆنراوەیەکی سەرکەوتوویان بەیەکەوە داناوەو، بیرو هەستیان لەو هۆنراوانەدا بەتەواوی یەکدی گیربوون و جۆشیان خواردووە. بۆ نموونە: لەهۆنراوەیەکیاندا بەناوی (فەلەک) بەم جۆرە دایان ناوەو لێرەدا چەند دێرێکی لێ دەخەینە ڕوو:ـ

**ئەوەی کەس بێ فەلەک دایم لە خوێنی خۆی دەگەوزێنێ،**
**کە پەنجەی شێری نەگبەت هات، ڕەگی ئاساری دەردێنێ!**
**کە تالع ڕۆیی نەگبەت هات تەبیعەت قاعیدەی وایە**
**لە چیمەن دا چەقەڵ هەڵسێ ئەبێ شێرێکی بشکێنێ!**

کاتێک لە نیوەی دووەمی دێڕە شیعری دووەم ورد دەبینەوە هەست دەکەین (دڵدار) بەو ناوەی کە نیوە دێڕانەکانی دووەم هی ئەون لە جیاتی وشەی (چەم) یا جەنگەڵ (دارستان) چووە وشەی (چیمەن)ی بەکار هێناوە، لەوانەیە لەبەر کێشی شیعرەکە وای کردبێ، دەنا ڕێوی و شێر لە چیمەندا ناژین و واڕاست بوو بڵێ (لەدارستان) یان (لە جەنگەڵدا). ئنجا لە کۆتایی هۆنراوەکەیان دەڵێن:ـ

**لە نێو دنیای ئەمەل (عەونی) بە عەزمێک و نەشاتی تۆ**
**دەسا فەرزە ئەتۆش (دڵدار) دڵی شێتت بفەوتێنێ!!**

هەروەها عەونی لە هۆنراوەیەکی دیکەیدا بەناوی (دڵ) بە یەکەوە لەگەڵ دڵداردا دایناوە و نموونەیەکی ناسکی شیعری دڵداریی کوردی یە و بەم جۆرەی خوارەوە دەست پێ دەکەن:ـ

**دڵ لە بەینی تەلعەتی ڕوو وزولفەکەی دەیجوورتە**
**گاهێ مەیلی شەو ئەکات و گاهی مەیلی نوورتە**
**بادەکەت پڕ ژەهری ماربێ بیدە پێم نۆشی دەکەم**
**چونکە تەبعم هێند موتیعە بەندەیی مەیسوورتە**

تاکو بەم دێڕە شیعرە کۆتایی بە هۆنراوەکەیان دەهێنن:ـ

**ئارەزووی ئەم شیعرە (دڵدار) تۆ لە (عەونی) بۆدەکەی؟**
**چونکە ئەم غەمبارە دایم بۆ وەتەن مەجبوورتە!!**

کاتێک کە لە هەردوو هۆنراوەکەیان ورد دەبینەوە، هەست دەکەین ئەوەندە ناوەڕۆکیان لەگەڵ یەکتری گونجاوە، کەس باوەڕ ناکات دوو شاعیر دایان نابن.

* عەونی و هێمنی مەهابادی:-

هەر کەسێکی بەوردی ئەم دیوانەی عەونی شاعیرمان بخوێنێتەوە، دەبینێ لە هەموو شاعیرێکی دیکەی کورد پتر خۆی لەشیعری هێمنی مەهابادی داوەو گەلێک لە هۆنراوە ناسک و ناودارەکانی کردووە بە پێنج خشتەکی و زۆر بە جوانی شیعرەکانی خۆی لەگەڵ گیانی شیعرەکانی هێمن دا گونجاندووە، هەروەک لە چەند نموونانەی خوارەوەی دەردەکەوێ:-

(١) لە پێنج خشتەکی کردنی هۆنراوە ناودارەکای «عەشق و ئازادی»ی شاعیری مەهابادی دا دەڵێ:-

**بە هیوا بووم کە شادی بێت و، خەم بڕوا دەمێکی تر**
**پزیشکم ساز بکا بۆ چاری زەخمم مەرهەمێکی تر**
**لەناکاو ئاسمانی گرتە بەر تۆزو تەمێکی تر**
**ئەگەر چی شەو درەنگە ساقی بۆم تێکە کەمێکی تر**
**کەوا ئەمشەو لە ناخم دا سەری هەڵدا خەمێکی تر**

(٢) لە پێنج خشتەکی کردنی هۆنراوەیەکی دیکەی هێمن دا بە ناوی (ماچی شیرین) دەڵێ:-

**ئەگەر بێ پەرچەمی ئاڵۆزو شێواوت لە ڕوو لاچێ**
**خەم و دەردو پەژارەم دوور نی یە بڕوا لەگەڵ با چێ**
**دەزانی خۆشەویستیت بۆ لە دڵ چەسپاوە دەرناچێ**
**بەمنداڵی لە لێوی ئاڵی تۆم ئەستاندووە ماچێ!**
**بەپیریش لەززەتی ئەو ماچە شیرینەم لەبیر ناچێ!**

ئەگەر ئێمە شوێن پێی ئەم لێک نزیک بوونەوەی شاعیریەتی عەونی و هێمن لەسەر زەمینەی شیعرەکانی شاعیری لێ هاتوومان هەڵگرین دەبینین خۆی دەگەیەنێتە هۆنراوە ناسکەکانی دووا دووای ژیانی، هەروەک لە هۆنراوەیەکیدا بەناوی(کە من هۆگر بەتۆ بووم)دا دەڵێ:-

**کە من هۆگر بەتۆ بووم تازە بۆچی دولبەرێکی تر،**
**دەرم کەی لێرە ناڕۆم ناچمە کووچە و دەرێکی تر**
**منی دیت نیوە کوشتەی نازی چاوی خۆیەتی فەرمووی**
**خەڵاتی مەرگە بۆ تۆ بگرە هادەی خەنجەرێکی تر**
**لەباسی تۆ نەوەستام بە پیری نازەنینی کورد**
**ئەگەر پەنجەم قەڵەم بگرێ دەنووسم دەفتەرێکی تر**

هەر ڕەخنەگرێکی شیعری هاوچەرخی کوردی ئەم هۆنراوەیەی عەونی شاعیری لێ هاتووی کورد بەراورد بکات لەگەڵ شیعرە دڵداری یە ناسکەکانی هێمن، ناتوانێ لەوە زیاتر بڵێ کە هەردووکیان لە شاعیریی دا هاوتای یەک بوون و ناتوانێ بڵێ کامیان لە کامیان باڵاترە، بەتایبەتی کە چەند دێڕێکی دیکە لە هۆنراوەکەی هەڵسەنگێنێ کە دەڵێ:-

**خەیاڵی بووکی شادی بۆ دڵی پەستم زەماوەندە،**
**دەنەی ژەن لێدە نەی با چووپی بڕوا چەند گەرێکی تر!**
**لە گوێم دەنگی زرنگا پێ ی گوتم: دڵگیر مەبە (عەونی)**
**ئەمە چەرخە دەسووڕێ دێتەوە دەوروبەرێکی تر!!**
**دوای خوێندنەوەی ئەم دێرە شیعرانەی شاعیری شیعر ناسکمان**

باسەرنجێکیش بدەینە چەند دێڕێکی هۆنراوە ناودارەکەی هێمن کە بەناوی «عەشق وئازادی» دایناوە، هەست دەکەین هەمان کێش و سەروا و هەمان تام و بۆی هۆنراوەکەی عەونی هەیە، بەڵام هیچ کامێکیشیان لە ئەوەکەی تریان وەرنەگیراون:-

**ئەگەر چی شەو درەنگە ساقی بۆم تێکە کەمێکی تر**
**کەوا ئەمشەو سەری هەڵدا لە ناخم دا خەمێکی تر**
**هەتاکوو دوا پشووی ڕێبواری ڕێگا عەشق وئازادیم**
**ئەگەر بێجگە لە ناکامیش نەبینم بەرهەمێکی تر**
**بە تۆ چاری چلۆن دەکرێ دەروونی پڕ لە ناسۆرم**
**خەساری بۆ دەکەی دوکتۆری زانا مەرهەمێکی تر؟!(٦)**

عەونی و شیعری چوارین:ـ

عەونی شاعیرێکی بیر تیژی هەست ناسکی ئەندێشە قووڵ بوو، زۆربەی شیعرەکانی فەلسەفەی ژیانیان گرتۆتە خۆ، بە تایبەتی کۆمەڵە چوارینەکانی بەو بیرە فەلسەفە ئامێزە ئاو داوەو، ناوەڕۆکێکی بە هێزو پتەوی پێ بەخشیون. لێرەدا چەند نموونەیەک لە چوارینانەی دەخەینە ڕوو تاکو خوێنەری ئازیز لە ڕاستی بۆ چوونەکەمان ئاگادار بێ و تام و چێژ لەچوارینەکانی وەرگرێ:ـ

١) شاعیر لەبارەی چارەنووسی نەتەوەی کوردەوە ئەم چوارینەی داناوە:ـ

**من کە کوردم کەی لە ئازادی وها بێ بەش کرام؟**
**ئەو دەمەی ماف بەش کرا، ئەو ڕۆژ بوو من بەش کرام**
**هاتە کار لەوح و قەڵەم بۆ چارەنووسی میللەتان**
**من حەواڵەی ئینگلیزی ڕوو سپی ڕوو ڕەش کرام!**

٢) شاعیر لە چوارینێکی تریدا لە ژیانی گوڵەوە دەدوێ و مەبەستیشی ژیانی ئافرەتی جوان و شۆخە و دەڵێ:ـ

**گولێکم دیت لە تافی نەوجەوانی**
**لەسەر تەختی بەهاری شادمانی**
**گوتم: ئەی گوڵ، مەبە بایی و بترسە**
**کە تۆ مەحکوومی باییکی خەزانی!**

٣) لە چوارینێکی دیکەیدا بەدابو دەستووری صۆفیێتی پەیمان بەستن و جامی تۆبە شکاندنمان بۆ باس دەکات و دەڵێ:ـ

**لەگەڵ پیری موغان دوێنێ لە ڕێ دا**
**بەسەد پەیمانە پەیمانم گرێ دا**
**شکاندم جامی تۆبە و زوهد و تەقوا**
**عەسا و تەزبێح و بەر ماڵم فڕێ دا!!**

**٤) لە چوارینێکی دیکەیشیدا شاعیر بەم جۆرە گفتوگۆ لەگەڵ یارەکەی دەکات و دەڵێ:ـ**

**گوتی: زوڵفم؟ گوتم: داوی بەڵایە!**
**گوتی: ئەبرۆم؟ گوتم: تیغی فەنایە!**
**گوتی: کولمم؟ گوتم: بۆ شەو چرایە!**
**گوتی: لێوم؟ گوتم: کانی بەقایە!!**

* عەونی و چوارینەکانی خەیام:ـ

عەونی لە ئەدەبیاتی فارسیشدا شارەزا بوو، تام و چێژێکی زۆری لە شیعری شاعیرە بەرزەکانی فارس وەردەگرت. بۆیە بەردەوام دیوانی شاعیرە ناودارەکانی بەوردی دەخوێندەوە، بەتایبەتی چوارینەکانی خەیام وتوانی لە ماوەیەکی کەمدا (١٤١) چوارینی هەڵبژاردە یان لێ بکاتە کوردی و هەر بە شیعر دایان ڕێژێتەوە و بە چاکی لە کارە ئەدەبییەکەیدا سەرکەوێ. ئەوەی سەرنج بداتە وەرگێڕدراوی چوارینەکان، هەست دەکات شاعیری لێهاتوومان هەوڵێکی زۆری داوە گیانی چوارینەکانی شاعیری ئەصڵییان تێدا بە زیندویی بهێڵێتەوە بۆیە وەرگێڕانەکەی لە وەرگێڕانەکانی شێخ سەلام و هەژاری موکریانی کەمتر نییە. لێرەدا چەند نموونەیەک لەو چوارینانەی دەخەینە ڕوو تاکو خوێنەری بەڕێز بزانێ عەونی شاعیری لێ هاتوومان تا چ ڕادەیەک لەو کارە ئەدەبییەیدا سەرکەوتووە:ـ

**بەوێنەو دیمەن، شۆخ و جوانم**

**لاله ڕوو، باڵا سەروی ڕەوانم**
**ئاشکرا نەبوو لە جەرگەی خاکا**
**بۆ دروست کرام؟ بۆ چی؟ نازانم!!**

***

**ئەم کەونە کاتێک هاتە کایەوە**
**هەرکەس بە جۆرێ لێکی دایەوە**
**بەڵام تا ئێستا لە ڕوویی ڕاستی**
**هیچی نەزانی هەروا مایەوە!**
**ڕیک کەوت ڕێم کەوتە کارگەی گۆزەگەر**
**دیم لەدەوری چەرخ وەستای پڕ هونەر**
**لە کەللەی پاشا و لە دەستی وەزیر**
**بۆ گۆزەی دەکرد، مل و دەست و سەر!!**

خوێنەری بەڕێز، عەونی لەمەیدانی ئەدەبدا، هەر شاعیر نەبوو، بەڵکو پەخشان نووسێکی خامە ڕەنگینیش بوو، هەر وەک لەو چەند نووسینانەیدا بۆمان دەردەکەوێ کە بە دەسنووسی بە جێی هێشتوون، لەوانە چیرۆکێکی یەتی بە ناوی (دیاریی لاوێک) و ناوەرۆکێکی پتەوی هەیە و وا لەگەڵ ئەم دیوانەیدا پێشکەشی دەکەین و، لە کۆتاییدا هیوادارم ئەدەب دۆست و شیعر ناسانی کورد، و چێژێکی خۆش لە هۆنراوەکانی وەرگرن و ئەم بەرهەمیشی شوێنێکی دیار لە کتێبخانەی کوردی بگرێت.

**هەولێر: ١٩٩٣/٦/٢٤**

-----------
---------
-------

## سەرچاوەو پەڕاوێز:

(١) دیوانی نالی ـ لێکۆڵینەوەو لێکدانەوەی مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس و فاتح عبدالکریم ـ بەغدا ١٩٧٦، ل٣٨٦.
(٢) دیوانی مەحوی ـ لێکدانەوەو لێکۆڵینەوەی ـ مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس و محەمەدی مەلا کریم ـ بەغدا ١٩٧٧، ل ٣٤٣.
(٣) عبدالرزاق بێمار ـ ڕۆژنامەی هاوکاری ـ ژمارە ١٥٢٠ ڕۆژی ١١/٨/١٩٩٢، ل٣.
(٤) کەریم شارەزا ـ گۆڤاری کاروان ـ ژمارە ٣ ساڵی ١٩٨٢.
(٥) عبدالرزاق بیمار ـ هەمان سەرچاوە.
(٦) هێمن ـ ناڵەی جودایی ـ بەغدا ١٩٧٩، ل ٥١.

# ژیانی عەونی لە چەند دێرێکدا

عەونی نازناوی شیعریی شاعیری نەتەوەیی کورد، عوسمان کوڕی حەبیب عەبدوڵڵایە. لە ساڵی ١٩١٤دا لە گەڕەکی بەفریقەندی شاری کۆیە، شاری هونەر و شیعری ڕەسەنی کوردی لەدایک بووەو چاوی ژیانی بە دیمەنی باخ و ڕەزانی کراوەتەوەو گوێی بە ئاوازی بولبولی باخ و کەوی قەد پاڵی باواجی و هەیبەت سوڵتان گۆش بووە.

درەنگ چۆتە بەر خوێندن. لە ساڵی ١٩٢٧دا دەستی بە خوێندن کردووەو تا پۆلی پێنجەمی سەرەتایی چووە، بەڵام کە باوکی کۆچی دوایی کردووە، لەبەر ئەرکی بەڕێوەبردنی خێزانەکەی قوتابخانەی بەجێ هێشتووە و لە دوکانی باوکی دانیشتووە. کەچی لەگەڵ ئەوەشدا وازی لە خۆ پێگەیاندن نەهێناوەو هاتوچۆی حوجرەی فەقێیانی کردووەو، لە مزگەوتی «حەتک» لەلای مەلا محەمەدی مەلا برایمی عەودالانی ناسراو بە (دلاوەر)ی شاعیر، هەندێ دەرسی ئایینی وەک (العقائد) و (الشرع)ی خوێندوە لەگەڵ ڕێزمانی عەرەبیدا. دوای ئەمەش بۆ ماوەی ساڵ و نیوێک زمانی فارسی لەلای مەلا ئەحمەدی ڕەش خوێندووە و بە چاکی فێری زمان و ئەدەبیاتی بووە.

دوای دەست هەڵگرتنی لە خوێندنی مزگەوتیشی هەندێ لە برادەرە دڵسۆزەکانی وەکو (میرزا عەبدولکەریم) و(محەمەد حەوێز)ی ناسراو بە (حەمەڕەش) کتێبەکانی خوێندنی پۆلی شەشەمیان پێ تەواو کردووە.

لەڕێگەی خۆ پێ گەیاندیشەوە جگە لە زمانی کوردی کە زمانی خۆیەتی، بە چاکی فێری زمانەکانی عارەبی و فارسی و ئەدەبیاتەکەیان بووە بە هۆی چەند مامۆستایەکی کورد پەروەر و ڕۆشنبیری وەک صالح قەفتان و عەلی ئاگا و عەبدوڵلا عەزیز و ڕەمزی رەحیمی ناودار بە (مامەند کەرکووکی) و خالید سعید، توانیویەتی هەست بە مانای کوردایەتی و گیانی نەتەوایەتی بکات. چونکە ئەو کورد پەروەرە بەڕێزانە دەورێکی بالایان بووە لە بلاوکردنەوەی بیروباوەڕی نەتەوایەتی کورد لە ناو قوتابیانی شارەکەی کۆیە و هەر شارێکی دیکەی کوردستان کە مامۆستایی یان تێدا کردبێ.

لەو سەردەمە زووەوە واتە لەسەرەتای سییەکانەوە، عەونی چۆتە ڕیزی هەڵگرانی مەشخەڵی کوردایەتی و چالاکانە بۆ ئەم مەبەستە پیرۆزە تێکۆشاوەو دوای دامەزراندنی حزبی هیوا ، لە سەرەتای چلەکانەوە بووەتە ئەندامێکی چالاکی ئەو حزبە کوردییە تێکۆشەرە، تاکو پتر خزمەتی نەتەوەی کورد و بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی نەتەوەکەی بکات.

تا ئەو حزبەی هیوا لەتێکۆشان دابووە، عەونی وەک ئەندامێکی چالاک و دڵسۆزی ئیشی تێدا کردووە، تاکو لە ساڵی ١٩٤٦دا پارتی دیموکراتی کوردستان دامەزراوە، ئنجا کەوتووەتە پاڵی و بووەتە ئەندامێکی کارای ئەو حزبە نەتەوەییە پێشکەوتن خوازەی کورد.

عەونی نیشتمان پەروەر هەرگیز لە ڕێبازی کوردایەتی لای نەداوەو و هەردەم پێی وابووە کە کوردایەتی تاکە ڕێگایە بۆ سەرکەوتن و بەدیهێنانی مافە ڕەواکانی میللەتەکەمان، بۆیە لەسەر ئەم هەڵوێستە مەبدەئییانەی زۆر جار لە ماوەی ژیانی خەباتی سیاسیدا تووشی ئازار و ئەشکەنجەو گرتن بووە، بە تایبەتی دوای ئەوەی کە دەورێکی دیاری لە بزووتنەوەی کوردایەتی و ئاشتی خوازاندا گێراوە چ بە هەڵوێستی ڕۆژانە چ لە ریگای شیعرەکانیەوە و چەندین جار هەر لە سەرەتای ناوەندی چلەکانەوە ئاشنایەتی بەندیخانەکانی (کۆیە و هەولێر و کەرکوک و بەغدا و کوت و نوگرەسەلمان) کردوەو ساڵی ١٩٦٣ بە خۆی و خێزانەوە توشی دەربەدەری و ئاوارەبوون بووە دواجاریش ساڵی ١٩٦٥ دوای شەڕ دەست پێ کردنەوە بۆ ماوەی حەوت مانگ لە بەندیخانەی هەولێر توندکراوە

عەونی و ژیانی شاعیری:ـ

عەونی لەساڵی(١٩٣٢)ەوە، دەستی بە شیعر نووسین کردووە، بەڵام ساڵی ١٩٣٥ دادەنرێ بەساڵی ژیانی شاعیری و چوونە ناو دنیای شیعری کوردی، چونکە لەو ساڵەوە هۆنراوەی پتەوی داناوەو جێ پێی خۆی لەسەر زەمینەی شیعری ڕەسەنی کوردی کردۆتەوە.

لەسەرەتا دا وەک هەموو شاعیرێکی ئەو سەردەمە بەغەزەل دەستی پێکردووە و چەند شیعرێکی ئۆپەرێتی بۆ قوتابییانی قوتابخانەکەی شاری کۆیە داناوە و دەستیشی داوەتە شیعری سیاسی و کوردایەتی.

عەونی لەگەڵ زۆربەی شاعیرانی کۆیە و کوردستاندا دۆستایەتی بەتینی بووە و شیعریان بەیەکەوە داناوە وبیروڕای خۆیان بەرامبەر بە شیعر وئەدەبیاتی کوردی دەربڕیوە و هۆنراوەی یەکتریان کردوە بە پێنج خشتەکی وەکو صافی هیرانی و مەیلی و دڵدار و

گۆران و هێمن و دلزار و گەلێک شاعیر و نووسەری دیکەی کوردستان.

لەگەڵ دروست بوونی یەکێتی ئەدیبانی عیراق لەدوای بەرپا بوونی شۆڕشی ١٤ی تەمووزی ١٩٥٨ بووەتە ئەندامی ئەو ڕێکخراوە ئەدەبییە و وەک شاعیرێکی کورد پەروەر، دەوری تێدا بینیوە. لە سالانی ١٩٥٩ و ١٩٦٠ وەک شاعیرێکی زمان زانی کورد بەشداریی لە کۆنگرەی یەکەم و دووەمی مامۆستایانی کورد لە شەقلاوە کردووەو لە لیژنەی زمانی کوردیدا ئەندامێکی کارا بووە.

لەساڵی ١٩٧٠دا دوای بەیاننامەی ١١ی ئاداردا و لەپاش دامەزراندنی یەکێتیی نووسەرانی کورد، بە ئەندامی ئەو یەکێتی یە وەرگیراوەو لە هەموو کۆڕو کۆنگرەکانیدا بەشداریی کردووەو، لە دوای دامەزراندنی کۆڕی زانیاریی کوردیش، لەساڵی ١٩٧٢دا بە ئەندامیی یاریدەدەری ئەو کۆڕە وەرگیراوە.

عەونی شاعیری هەڵکەوتووی کورد، بەرهەمی شیعریی لە زۆربەی گۆڤارو ڕۆژنامە کوردییەکانی وەکو گەلاوێژ وبەیان و هەولێر و کاروان و هاوکاریی و برایەتی بڵاوکردۆتەوەو ناوبانگی شاعیریی بە هەموو لایەکی کوردستاندا بڵاو بۆتەوە و زۆر جار ئیستەگەکانی رادیۆو تەلەفزیۆنی بەغدا و کەرکووک هەوڵیان داوە چاوپێکەوتنی ئەدەبی لەگەڵدا ساز بکەن و پیشانی بینەرانی کوردی بدەن، بەڵام ئەو ماوەی نەداون چاوپێکەوتنی لەگەڵدا بکەن و پێشەکی لەوە گەیشتووە کە شیعرە نەتەوەیی یەکانی ڕژێم ماوەی بڵاوکردنەوەیان نادا.

عەونی بەرهەمی شیعریی زۆرە و سانسۆری دام و دەزگای ڕژێمی بەعس ماوەی چاپکردنی دیوانەکەی نەداوە. بەڵام ئێستاکە لە سایەی پەرلەمان حکوومەتی هەرێمی کوردستان وا سەرجەمی هۆنراوەکانی لەم دیوانە قەشەنگەیدا پێشکەش بە شیعر دۆستانی نەتەوەی کوردی دەکەین، هیواداریین بە چاوی هەڵسەنگاندن ونرخاندن سەیری بکەن.

عەونی شاعیر و خەباتگێڕی کورد پەروەر، ژیانێکی پڕ کێشەو ئازارو ئەشکەنجەی بەسەر برد، بەتایبەتی لەم ساڵانەی دواییدا سەرەڕای خوشکو برا مردن و کۆست کەوتنی، ڕۆژ بە ڕۆژ بەدەست نەخۆشی هەناسە تەنگییەوە پەرێشانتر دەبوو، ڕژێمی بەعسیش لە دوا پەلەقاژەی نەمانی لە کوردستان، شاری کۆیەی تۆپ باران کرد و ماڵەکەی شاعیر یەکێک بوو لەئامانجی گوللەکانی و چەند پریشکێکی بەرکەوت و بریندار کرد، ئەو کارەساتە سامناکە ڕێگای کۆچی دوایی کورت کردەوەو، لە ڕۆژی ١٩٩٢/٧/٢٠دا دوعا خوازیی لە کەس وکارو کوردو کوردستان کردو تا هەتایە چاوی ژیانی لێک نا و تەرمی پیرۆزی بەشانی ئەدیب و نووسەران و جەماوەری شارەکەی کۆیەی تێکۆشەر برایە گۆڕستانی باسکی عارەبیان و بەخاکی نیشتمان سپێردرا.

عەونی شاعیر و نیشتمان پەروەر بۆ کورد ژیا ولەپێناوی ئامانجەکانی بە هێمن خەباتی کردو بە هێمنیش سەری نایەوەو، دوای هیوای لە ژیاندا ئەوەبوو، لە دوای مردنی کورد بە ئامانجە نەتەوەیی یەکانی خۆی بکات و ڕۆژێک دابێ ئاڵای ئازادی کورد لە هەموو لایەکی کوردستانی سەرفرازدا بشەکێتەوە.

**فەرهاد عەونی**

## له دووری تۆ

لەدووری تۆ دڵی زارم ئەگـــەر زاری نەکـــا چ بکا
له چاوان خوێن وەکو دیجله و فورات جاری نەکا چ بکا

وەکو بولبول بەشین و ناڵە گوڵشەن گەر نه شێوێنێ
له دەستی باغەوان شەکوا له بەدکاری نەکا چ بکا

لەشامی پەرچەمت گەر شەمعی روخسارت بگیرسێنێ(١)
وەکو پەروانه دڵ گەر مەشقی دڵداری نەکا چ بکا

لەگۆشەی بێ کەسی دا بێ ئومێد و بێ ئەمەل ماوه
لەژین بێزاره داوای مەرگی یەکجاری نەکا چ بکا

ئەوەی کوشتەی نیگاهت بێ بەدەرمان ناکرێ چاری
لەلای تۆ گەر بەیانی دەردو ئازاری نەکا چ بکا

کەسێ گەر بەستەیی زولفی کەمەندی یاری شیرین بێ
وەکو فەرهاد له بێستوون کۆهکەن کاری نەکا چ بکا(٢)

گوتی: (عەونی) ئەگەر بێ باخەوان باخی سینەم بێ
به نارنج و تورنج وسێو وبێ یاری نەکا چ بکا!!

(١) شام: سەرەتای شەو، ئێواره
(٢) کۆهکەن: کێو هەڵکەندن.

## چەنده خۆشه

چەنده خۆشه دڵ له ڕابردووی من تۆ یاد دەکا
داستانێکه که باسی شیرین و فەرهاد دەکا!

موڵکی ئاشووری دڵی وێران و خاپوور کردووم،
هێرشی غەمزەت لەسەر بازانی ئازای ماد دەکا

تاقی کیسرایه برۆت چاوت وەکو نەو شیرەوان
داوەرێکه لەم دەره فەرمان ڕەوایی وداد دەکا(١)

ماوەیێکه دڵ گرفتاره له چینی پەرچەمت
جەژنه وەعدی فەرمووه گیراوەکان ئازاد دەکا

وا له ژێر باری خەمت دەستم له ئەژنۆ گرتووه
هەر بزەی لێوی تووه تەنیا ئەمن دڵشاد دەکا

چاوی باز، ئەبرۆ کەوان، تیر بژانگ، زولفی کەمەند
هەر بەچاو نوقاندنێک ڕاوی دووسەد سەیاد دەکا

(عەونی) پیری من بەمەی فتوای حەلاڵی فەرمووه
ئافەرین لەو پیره بێ بۆ گەل به خێر ئیرشاد دەکا!!

(١) داوەر: بەداد، دادوەر، حاکم.

## وێنەکەت

بەگریان قەت نەشۆرا وێنەکەت هەرگیز له چاوم دا
دڵۆپێک کەم نەبوو یادت له دڵ شووشەی شکاوم دا

که دیتم دولبەرم دڵگیره لێم، پێم گوت که بم بەخشە
گوتی: ئەبرۆ و موژەم بۆ کوشتنی تۆ تازه ساوم دا

وەها چەسپا له جەستەم خۆشەویستی تان تەماشاکە
نیگاری(١) خۆت دەبینی چۆن لەناو خوێنی ڕژاوم دا

دڵە ڕەنجاوەکەم وەک هاته لای تۆ بێ سەرو شوێنه
گوتی: لێره له ژێر پێم کەوتبوو ئیمرۆکه قاوم دا

هەڵەی دڵ بوو که ڕەنجا دلبەرم فەرمووی بەڵێن وابێ
هەتا ماوه دەبێ بەندبێ له چینی پرچی خاوم دا

که دوێنێ نامەکەم دا دەست سەبا بۆ کۆیی(٢) دڵدارم
بەیانم کردبوو دەردم لەگەڵ ڕێزو سڵاوم دا

له کالای (٣) بەرهەمم چەند پارچەیێکم برد له بازارا
به پاره نەی کڕی کەس لێم بەبێ پوول و دراوم دا

(١) نیگار، شکڵ، وێنه
(٢) کۆی: گەڕەک
(٣) کالآ: کوتاڵ، قوماش

## لەگەڵ پیری موغان دا

١٩٨٩/٣/١٤

لەگەڵ پیری موغان دوێنێ لەڕێ دا
بەسەد پەیمانە پەیمانم گرێ دا

شکاندم جامی تۆبە و زوهد وتەقوا
عەساو تەسبیح و بەرماڵم فڕێ دا

هەتا مردن کە دەرناچم لە بەندی
کەمەندی زوڵفی ئەو شۆخەم لە پێ دا

نهێنی جوانی ڕووی تۆم پشکنی بوو
لەدەرسی یێکەمینی ئەلف و بێ دا

کە زانیم دێ یە لام دەردم دەپرسی
سەرم هێنا لە ژێر پێت خستمە ڕێ دا

لە دوو لا پەرچەمت ڕووی گرتە باوەش
منی تۆراند و سامانی بە کێ دا

لە (عەونی) گەر دەپرسی تەندروستی
ئەتۆ خۆش یەک نەفەس ماوە لەڕێ دا

## ئابڕوی تکا

١٩٨٦/٨/٩

خونچەی لێوی کردەوە وەک پێکەنی ئابڕوی تکا
چەند دڵۆ پێیک شەونمی شەرمی بەسەر روودا تکا

باخەوان شادبوو گوڵی بینی لە باخ پشکوتوە
بولبولیش خۆی رەنجەڕۆ زانی دەبێ شیوەن بکا

هێندە بایی بوو بە ڕەنگ و ڕوو لەتافی جوانیا
تاکو وەیشوومەی خەزان لێ یدا لق وپۆپی شکا

تا نەڕەنجێ لێم زیاتر یاری ناسکتر لە گوڵ
لێ ی مەکەن هەرگیز تکا گەر دژ بەمن هەرچی بکا

نە ئادەمی نە پەری
نەوەک کچی کۆچەری

بەم ئاوات و نیازە
بەم دەنگ و بەم ئاوازە

کیژێ تۆم دی وام زانی
تۆ کچی کوردستانی

بە یەزدان و بە زەردەشت
بەو فریشتانەی بەهەشت

ئەگەر ئەوی بە ڕاستی
ڕزگار دەبم لە پەستی

نازدارەی ماه ڕوخسار،
ئەوەی بیست هاتە گوفتار

لەسەرەتا تا ئەنجام،
وەهای پێ گووتم وەرام

من گۆران، تۆ کرمانج
هەردوو بۆ شوێن یەک ئامانج

هەر دەڕۆین و پێ ناگەین
هەر دەلێین و تێ ناگەین

شێوەی ئەم گفتوگۆیە،
لاوی کورد ڕەنجەڕۆیە!!

نە لە یەک دەگەین
نە بە یەک دەگەین!!

# خەون وخەو

ئافرەتێکم لە خەوا دی کزو ڕەنگ زەردو نەخۆش
پەست و دڵگیر بوو کە فرمێسکی دەڕشت زۆر بە پەرۆش

گوتم: ئەی خوشکی بەڕێزم چی یە هاوار و گرین؟
بۆچی کردۆتە بەرت بەرگی ڕەشی ماتەم و شین

گوتی: نازانی مەگەر بۆچی بەسەر هاتی من
شین و ڕۆ ڕۆیە هەموو وەخت و دەم و کاتی من؟

ئێستە نام ناسی یەوە من کچەکەی کەرکووکم؟
خاوەنی نازو نیاز بووم و ئەویستا چووکم!!

ڕەنگ و ڕووم زەرد بووە دووچاری پەژارە و دەردم
من لە کەیم هەستی و بەد بەختی لە عالەم فەردم

وا خەریکن بە هەموو شێوە بگۆڕن ناوم
چونکە بەم ناوە کە ئێستاکە هەمە ناسراوم

من بەشێکی وەتەنی کوردم و کوردستانم
خاوەنی مێژووەکی کۆن و هەزار داستانم!

گوتم: ئەی کچ بەسە پێویست نی یە گریان و شین
دڵنیا بە هەموو تیمار دەکرێن زام و برین

شەقڵم لێ داوە بە کوردی لە هەموو دەشت و بەنت
نا توانن بە درۆ و ساختە بگۆڕن ڕەسەنت!

وا مەزانە نەتەوەی کوردکە لە تۆ بێ خەبەرن
هێندە ئارام بە هەتا بەم زووە یەکتر دەگرن!

چاک دەزانن لە هەموو لاوە نیازی بەدکار
هەر خەریکن کە لە ڕەگ بێننە دەر کوردی هەژار

تۆکە تەنیانی دەناڵێنی لە دەست داگیرکەر
موتەلایە وەکو تۆ خاک و ولاتمان یەکسەر

بەچە شێران، کوڕی کورد، زێدە بە قین وقاڕن
تووڕەنە، داخ لە دڵ و دوژمنی بەد ڕەفتارن!

هەر بە کـــاتێکی لـەت وپەت دەکـــرێن دوژمنـی تۆ
قـــەڵ و داڵ هێـــزی نی یە دەرچێ لەدەست بازو هەڵۆ

لە چەپ و ڕاست کـــە پەلامـــار دەدرێن خـــوارو ژوور
تا بە ســـەر شـــۆڕی هەمـــوو ڕادەکـــەنە دوورِ لە سنوور

ئەو دەمـــە شـــاد بە ئەتۆ بەرگی ڕەشت دا بکەنە
هەر بە ڕوو ســـووری لە باخت گـــوڵی هیـــوا بچنە

خـــەبەرم بۆوە بەســـەر ســـامی یەوە نیـــوە شـــەوە
تێگەیشـــتم ئەمـــە هوشیـــاری نی یە خـــەون وخـــەوە!!

**کۆیە ١/١/٩٨٥**

## ساڵی نوێ

١٩٦٨/١٢/٣١

یـەکـــــــــەم ڕۆژی ســـــــــاڵـی نـوێ
بـە خـــــێـــــر هـاتـی لـە مـنـت کـــــەوێ
دەزانـــــی مـــــن چـــــیـم لـــــێـت دەوێ؟
بـــۆم بـگـــەڕێ لـــێـــــــــــرەو لـــەوێ

لـــە پـــزیـــشـــکـــێـــکـــی شـــــــــــارەزا،
لـە نـە خـــــۆشـی یـەکـــــــەم تـێ بـگـا،
لـــە مـــــــــێـــــــــژە ئـــازارم دەدا
کـــــــــە نـەفـت بـووم هـێـــــــزم لـێ بـڕا

ڕێ ی نـیـــــــشـــــــان دام دڵـســـــــۆزانـە،
نـاردمـی بـۆ نـەخـــــۆشـــــخـــــانـە.
پـــــزیـــــشـــــک پـــرســـی بـــرایـــــانـــــە
کـێ ئـەتـۆی هـێـنـا ئـێـــــــــــرانـە؟

پـــێ ی گـــــــــــــــــوتـم: دەردت دژوارە
زۆر زۆر بـــــــە ئـــــێـــــش و ئـــــازارە،
دەرمــــــانـی تـۆ کـــــــوا لـەم شــــــارە
چـەنـد بـبـــــەخـــــشـی پـوول و پـارە

ئـەی بـچـــــــمـە کـــــوێ بـۆ دەرمـــــانێـک
دەســـــت بـــدا بـــۆ دەردو ژانــــێـــــک،
بـە پـرســـــــــیـــــــــار و لـێ دوانـێـک،
کـــــە دەســـــتـم کـــــەوێ لـوقـمـــــانـێـک!

ئەم پزیشکە شارەزایە،
خاوەن بەهرەو توانایە،
دەرمانی بۆ تۆ دانایە
بەکارهێنانی ڕەوایە!!

یەکبوون چاکترین دەرمانە،
ئەو دەرمانەش لای خۆتانە،
دەرچوون لە دەستی بێگانە
هەڵ دەگری ئەم دەردو ژانە!

لە پزیشک و ساڵی نوێ
ئامۆژگاریم لێ یان دەوێ
منیش گەر هیچم دەست کەوێ
کۆڕێ دەبەستین بۆ شەوێ!!

## کام گوڵ؟

کام گوڵ، کام خونچە، کام وەرزی بەهار
شینی نەگێڕا هوزاری هەژار؟

کام فرمێسکی چاو کام سۆزی دەروون
نەڕژا بە ڕوودا سوور وەک ڕەنگی خوون؟

کام بزەی لێوی کام کۆرپەی ساوا
کام دایکی هەژار ئەسرین لە چاوا؟

کام باوکی پیری ناوقەد دا چەماو
نە گریاو نەڕژا فرمێسکی لە چاو؟

کام ماڵ سووتاوی بێچارەی هەژار
کام بێ تاوانی کە نە درا لە دار؟

کام دایک دەبینی بەرگی ڕەش نەبێ
لە هەموو مافی ژین بێ بەش نەبێ؟

کام باوک لە شینی ڕۆڵەی بێ گۆڕی
یاساغ نەبوولێ ی بەرگی بگۆڕی؟

کەی ساوای ئێمە بزەی لە لێوە
هەر چاوی گەشە فرمێسکی پێوە؟

کام ماڵ سووتاوی کوردی ئاوارە
پێی نەگوتراوە مەڵێ هاوارە؟

کام خونچە گوڵمان لە باخی ژیان
پێش ڕەنگ هێنانی هەڵیان نەوەران؟

## بەرەو هەورازی سەرکەوتن

کۆچ بارکۆچی کرد بەرەو کۆهساران
بنەو بارگەیان خست لە نزاران

بەرەو هەورازی سەرکەوتن دەڕۆن
مژدەی سەربەستی دەدەن بە یاران
دوا حەشارگەم بێ، لانەی خوێناویم
دەگەڕێمەوە لای گیان سپاران!

بە خوێنی سووری زامی ناسۆرم
دەبێ ڕەنگین بێ مەکۆگای جاران!!

## شین بۆ پێشەوا(*)

لە سی مارتی چل و حەوتا
لە چەپ گەردی چەرخی چەوتا

لە مەهاباد لە چوار چرا
داری بێ دادی هەڵکرا

ئەو دارەی پێش نیوە شەوا
وەستا لە ژێریا پێشەوا

گوتی: ئێستا دەڵێم کوردم
لە ڕێی ئازادی کورد مردم

شەوێکی پڕ تاسەو خەم بوو
لە کوردستانا ماتەم بوو

شین بوو، ڕۆ ڕۆ بوو فەریاد بوو
بۆ پێشەوای مەهاباد بوو

لە مێژووی کوردا ئەم شەوە
هەتا ئەبەد ناسڕێتەوە!

مێژووی کوردی پڕ کرد لە قین
بەرامبەر زۆر داری لەعین

ڕۆژێک دێت کورد هەڵمەت بەرێ
تۆڵەی لە دوژمن وەرگرێ

هەزارانی وەک پێشەوا،
خوێنیان ڕژا بە نارەوا!

کورد ناترسێنێ سێدارە،
کرداری دەستی زۆردارە!

هەر دەبێ زۆر دار کەساد بێ
زۆر لێ کراویش ئازاد بێ

کورد دەبێ بۆ خۆی هوشیار بێ
نا بێ لەکەس هیوا دار بێ

دەبێ زاناو هونەر مەند بێ
لە زانستا دەوڵەمەند بێ

پێشەوای کورد بە بێ ترسان
کردیە ملی پەتی خنکان!

لە دوا هەناسەی پێش مەرگی
ئەمەی فەرموو بە دڵ تەنگی:

بۆ شۆرەوی شوورەیی بوو
ئێمە هیوامان بە وی بوو

لە مەهابادی ئازادا،
کە هیوای کوردی بە بادا!!!

(*) ئەم هۆنراوەیە لە ڕۆژنامەی (خەبات) ی ژمارە ٦١٨ی مانگی ئاداری ١٩٩٢ بلاوکراوەتەوە.

## لەم جیهانە

لەم جیهانە دڵ پەشێوو چاو بە گریان هەر منم
دەر بەدەر، ئاوارە، بێ کەس، خانە وێران هەرمنم

شادو سەربەستن هەموو کەس وا بە ئازادی دەژین
دیل و ژێر دەست و هەژارو بەندی زیندان هەر منم

شەعبی ئەفریقیا خەریکە یەک بەیەک ئازاد دەبن
کوردم و تەنیا کە بێ بەش مافی ئینسان هەر منم
دوژمنی خۆ بوونی خۆمم ئاشنای بێگانە بوون
بۆیە شایانی شەق و نەفرین و لێ دان هەر منم

کانی زێرینم هەیە پوولم لە گیرفانا نی یە
خاوەنی عەردو بەراو، بێ ئاو و بێ نان هەر منم

## ئێمەی کورد

ئێمەی کورد یەکجار کەم هەست و خاوین
لە قافلەی گەلان گەلێک جێ ماوین!!

ئێمەی دواکەوتوو تازە وەک منداڵ
کەوتووینە سەرپێ دەکەین گڕ و گاڵ

ژیانی ئێستاو سەد ساڵ لەمەو بەر
هیچ نەگۆڕاوە لە پێ هەتا سەر!

نەخوێندەوارو کەم هەست و پەستین
دژی خوێندن و زانست و هەستین

بۆیە ژێر دەست و دیل و داماوین
وەک گای قوربانی بەش بەش کراوین

ئەوەی کەم زانست، نیو خوێندەوارە
بێگانە دۆست و خزمەتگوزارە!!

بۆ پارە هەردەم جەرگی پارەیە،
تا مردن پیشەی هەر ئەو کارەیە!

# چارەنووسی کورد

نیشتمانی شیرینم،
تۆی هیواو شادی ژینم

خۆشەویستی ی تۆ تەنیا،
بە منی بە خشی هیوا!

من زۆر هیوا بڕاو بووم
ناکام و کاڵ و خاو بووم

خۆشەویستی و دڵداری
خستمیە ڕێ ی هوشیاری

کاتێ خەو دەی بردمەوە
تۆبووی ئاگات کردمەوە

هەستام لە خەوی مەستی
هاتمە ناو کۆڕی هەستی

سەرنجم دا لە هەر لا،
هەر خۆم بینی بە تەنیا

لە گێتی پان و بەرین
من بێ بەش ما بووم لە ژین

مەرجم کرد لەگەڵ یەزدان
سوێندم خوارد بە کوردستان

ڕۆژ و شەوم نەسرەوم،
دەبێ منیش سەرکەوم!!

بە فرمێسکی مرواریم،
تاری ڕشتەی هەژاریم

خەم وپەژارەو تاسە،
لەگەڵ بۆسۆی هەناسە

لە گڕی ناخی دەروون
لە قوڵایی دەریای خوون

گەوهەرێکی نرخدار،
بێنمە بەر چاوی کڕیار!

پارچە پارچە شیعری جوان
بهۆنمەوە بێ وچان!

بیفرۆشم بە یەکجاری
بیبەم بۆ لای کڕیاری

پوول و دراو وەر بگرم
چەکی شەڕی پێ بکڕم
بیدەم بە تۆپ و تفەنگ
بۆ پێویستی ڕۆژی جەنگ!

بی بەخشم بە کوڕی لاو
لەگەڵ جوانترین سڵاو!

ئەو مافم بۆ وەردەگری
ئەو لێم دەکا بەرگری

ئەو خوێنی خۆی دەڕژێنێ
ئەو تۆڵەم بۆ دەستێنێ

سوێندم بەم نیشتمانە
بەڵێنێکی مەردانە!!

تا گیان مابێ لە لەشم
لە کردەوەت هاو بەشم!

تاکو ئەو ڕۆژە دەمرم،
دەست لە خەبات هەڵ نەگرم!

لەگەڵ لاوانی نەبەرد
بگەڕێم لەدەشت و هەرد

ئەو بە چەک، من بە پێنووس
تا دەگەینە چارە نووس

چارەنووسێک پڕ داد بێ
کوردی تێ دا ئازاد بێ!!

# سەربەستی ناکڕێ

دەڵێن سەربەستی ناکڕێ
ماف وەردەگیرێ نادرێ

دەبێ چەکی بۆ هەڵگری
بە پشووی بۆ بەرگری

دەبێ خوێنی بۆ بڕژێنی
دەبی ڕۆڵەی بۆ بمرێنی

کوردیش چەکی هەڵگرتووە
خوێنی لاوانی ڕێژتووە

چەند هەزار گوندمان سووتاوە
ماڵیان بە تاڵان براوە!

هەزار دایک بەرگ ڕەشن
لە شادی و خۆشی بێ بەشن

منداڵیان بێ باوک ماوە
ڕۆڵەیان شەهید کراوە!

لە ڕێ ی سەربەستی و ڕزگاری
بۆ مافی گشت کوردەواری

کوردستانی بەش بەش کراو
برا لە برا دابڕاو!!

بۆ ئازادی بۆ یەکگرتن
خەبات ، تێکۆشان تا مردن

هەموو ناکۆکیمان گۆڕ کەن
خۆمان شادو دوژمن کۆڕ کەن

مەرج و بەڵێن وا دانرا
دەست لە ناو دەست کەین وەک برا

**کۆیە:٣/١/١٩٧٠**

# نەسرین

نەسرین گوڵی بەهارم
نمونەی ڕۆژگارم،

کچێکی کوردستانم،
جوانێکی کوردگارم!!

نەسرین ئیمڕۆ بەهارە
خۆشترلە ساڵی پارە

بابڕۆینە سەیری باخان
لەو دەشت و مێرگوزارە

نەسرین ئیمڕۆ نەورۆزە
لێت بێ جەژنە پیرۆزە

لە کوردستانی ڕەنگین
جەژنی گشت تیرەو هۆزە

ڕۆژێک بە یادی مەستی
دەستم گەیشتە دەستی

پێم گوت: نەسرین تو بی خوا
گەرلێرە ڕانەوەستی!

کە وەستا بانگی کردم
بەم گوتە هۆشی بردم

بۆیە سووکم لەلاتان،
چونکە کچێکی کوردم!!

# بەیادی کاوە

کۆیە ١٩٨٣/٨/٢٠

ئای بۆ کاوەیێ، وەک کاوەی نەمر،
بێتە مەیدانێ نەبەرد کت وپڕ!!

بە دەستێ ئاڵا، بە دەستێ کوتەک
بە بیرو بڕوا بەهێزی مەچەک

هەموو هێزی گەل یەک ڕەنگ یەک بڕوا
بەرەو ئازادی و رزگاری بڕوا

لەگەڵ لاوانی چەوساوەو هەژار
هێرش بەرنە سەر قەڵاتی زۆردار!!

لە ڕەگ و ریشە، هەڵی وەشێنن!
بەردی بنچینەی گشت بەدەر بێنن!

زۆردار پەتک کەن وەک سەگ بە زنجیر
بیکەن بە پەندی ڕۆژگاری پیر

لە دادگای گەل دا بنووسرێ فەرمان
بکرێ بە بەریا بەراتی خنکان!

مافیان وەرگرن زۆر لێ کراوان
کاریش بسپێرێ بە کوڕ کوژراوان!

پاک بکرێتەوە ولات لە زۆردار
گۆڕ بکرێ هەموو دروشمی بەدکار

بۆ بەختیاری بۆ شادمانی
بە حوکمی یاسای زەوی و ئاسمانی

لە ناو کۆمەڵ دا هەرکەس بە تەنیا
لەسەرو ماڵی ببێ دڵنیا

سەر لێ شێواویی و پاشا گەردانی
ئەنجامی ڕەشە دەبێ بیزانی

گەر موتاڵاکەی مێژووی ڕابردوو،
زۆر ڕووداوی وای لێ هاتووتە ڕوو

ئەوەی حەزبکا بمرێ بە پاکی
شاهیدی ئەدا کردەوەی چاکی

ئەوەی بەد کار بێ ئەنجامی ڕەشە
لەناو کۆمەڵدا سووک وڕوو ڕەشە

ئەوەی کە چاکەی کردۆتە پیشە
نەمرە، نامرێ، دەژی هەمیشە

بۆ هاو ڕەگەزت خزمەت گوزار بە
بۆئازادیان گورج و بەکار بە

سستی مەنوێنە چیت توانایە
پاداشتی چاکەت لەلای خودایە

## کورد و کاروانی ئازادی ی گەلان

لەگەڵ کاروانی ئازادیی گەلان
کورد هاوبەش بووە بەبێ پشوو دان

وێڵ و سەرگەردان، لەو بیابانە
ڕەنجی کێشاوە لەم ڕێگەو بانە!

هەرگیز ناوەستێ، قەت نەوەستاوە
هەر بۆپێشەوە هەنگاوی ناوە!

کوردیش هەروەکو گەلانی جیهان
بۆ ئازادی خۆی هاتۆتە مەیدان

لەزۆر مەڵبەندو لە ڕێ گوزارا
چەندان سەرداری کران بەدارا

بەڵێ هەزاران ڕۆڵەی دلێری
پیرو جوانی وەک بە چە شێری

قـــــــەڵاچۆ کـــــــران یـان لـە زینـدانـا
مـــــــــردن و بـێ بـەش بـوون لـە ژیـانـا

هـەزاران مـــــاڵیـــــان لێ وێـران کـــردن
مـــــاڵ و ســـــامـــــانیـــــان بـە تـاڵان بـردن

لـەگـــــــەڵ ئـەم هـەمـــــــوو ئـێش و ئـازارە
ســــــــووتـان وخنـکـان، بـەنـدی و قــــــــەنـارە

دەم بـە دەم خـــــۆشـتـــــر هـەنگاو هـەڵ دەگـــــرن
نـاوەسـتن ڕێـگـای دوور و ســـــــــەخـت دەبــڕن

بـــۆ ئـەوە ڕۆژێـک بـگـەن بـە شـــــــــادی
بچـــــێـــــــــژن تـام و چێـــــــــژی ئـازادی

ئـەگـــــــــەر هـەروەهـا بــڕۆن نـە ســـــــــرەون
دەگـــــــەن بـە ئـامـــــــانج هەر ســـــــەر دەکــــــەون

بـرا نــەوەســـــــــــــــــتـی دڵـت نـە لـەرزی
تـا کـــــــو دەگـــــــەیتـــــــە ســـــــەر لـووتـکـەی بـەرزی

ئــازادی بـــە ڕەنج بـە تـێـکـۆشـــــــــــــانـــە
بەرهـەمـی هـەوک و خـــوێن وئـێـــســـــــــــقـــانـە

گـــــــەر نـەمـــــــری لـەرێ ی ئـازادی گـــــــەلت
لـە دەســـــــــتـت دەڕوا دەرفـــــــــەت و هـەلت

گــــــــــەلـێـک ژێـر دەست بـێ دوور لـە ژیـانـە
بـەشی ئـەو گـــــــەلـە مـــــــەرگ و نـەمـــــانـە!

تـام چێـــــــــــژی ژیـان بـە ئــازادی یـە
گــــشت بەخـــتـــــەوەری و خـــۆشی و شــادی یە

لەم کـــاروانەی کــورد ناوەســـــتـــێــتـــــەوە
تا ســــــەر بەست نەبێ ناگــــــەڕێتـــــــەوە!

بە خـــوێن مـــۆر دەکـــا نامـــەی ســـەربەستی
تا وەری نەگـــرێ و نەکـــــەوتە دەســـــتی

ســـوێندی خـــواردووە بە کــــوردســـــتـــانی
بە گـــۆڕی قـــازی و شـــەهیـــدەکـــانی

ژین بە سەربەستی ، مردن بە مەردی
دەبێ چارەنووس وابێ بە کوردی

هەر خەبات دەکا بەبێ وچانی
کۆڵ نادا هەتا مابێ ژیانی!

## ئەی بادی شەماڵ

ئەی بادی شەماڵ، ئەی سروەی بەیان
نامەی ناردووە بۆت، دایکی نیشتمان

زوو وەری بگرە، ئازاو و دەست و برد
بگەڕێ هەموو نیشتمانی کورد!

بڵێ: گوێ دێر بن، لەم بانگەوازە
دایکی نیشتمان ئەمەی دڵخوازە!!

مەڵێن دوژمنمان زۆر نا تەبانە،
بۆ نەمانی کورد گشت وەک برانە

ئێستا لەسەرچی لەگەڵ یەک دژن؟
بۆسوودی دوژمن یەکتر دەکوژن؟!

دژ بەیەک هەردەم لەناو سەنگەرن
ئەی چەند نەزان و چەند ئاخر شەڕن

دوژمن خەریکە هێرشێک بێنێ
خاکت داگیر کا، خوێنت بڕژێنێ

ئێستا دەرفەتە هەموو بەیەک دەنگ
بوەستن لە ڕووی هێزو زەبرو زەنگ

نازانم بۆچی هێندە بەدکارن
لەگەڵ یەک هەموو وەک گورگی هارن؟

هەردەم خەریکی گیانی یەکترن
هەرگیزاو هەرگیز یەکتر ناگرن!

ئاوا خەریکن دایکی نیشتمان
ڕزگار کەن لە ژێر دەستی دوژمنان؟

داخم ئەوەیە من تاکو ماوم،
لەیەک گرتنتان هیوا بڕاوم!

ڕاستتان پێ دەڵێم قەت ڕزگار نابن
هەتا لەگەڵ یەک وا ناتەبا بن!!

## ئەستێرەی هیوای کورد

نە لە ڕۆژ ئاوا، نە لە ڕۆژ هەڵات
ئەستێرەی هیوای کورد بو هەڵ نەهات؟

دەڵێن لە ماوەی سەد ساڵ دا یەک جار
هەڵدێ ئەستێرەی سووری کلکدار!!

دوو هەزار ساڵە کورد وا مایەوە
ئەستێرەی هیوای نەدرەوشایەوە!

مەسەلێک هەیە بە کوردی دەڵێ
چاوی لە دەرێ خۆڵی تێ وەرێ

گەر ڕۆژ هەڵاتە گەر ڕۆژ ئاوایە،
بۆ گەلی هەژار کەی جێ ی بڕوایە؟

بەرژەوەند پەرست بۆ سوودی خۆیان
بلوێر دەژەنن، کۆگای درۆیان!

بۆ دەست کەوتنی لیترێک نەوتی ڕەش
بە کوشتن دەدەن هەزار سپی و ڕەش

برا چارەمان تەنیا خەباتە!
برایەتی و یەک بوون ڕێگای نەجاتە!

بە هەڵمەت بردن وەک شێری شەرزە
تەختی ڕۆژگار بێنینە لەرزە!

بێ ترس و بێ باک، ئازا و نەبەز بین
بابڕووخێنەری قەڵای ناحەزبین

بە هونەرمەندی و بە زۆری بازوو
خۆمان بخەینە تابەی تەرازوو!!

## نەورۆز و بەهار

نەورۆز و بەهار وەک جووتەی خوشکان
لە شادی کڕین ئەمساڵ تێ شکان!

بەهار بنەوشەی لە زستان کڕی
کراسی جەژنی بۆ نەورۆز بڕی

بۆچی نەی زانی بنەوشەی سەر شین
بۆ شایی نایە هەر دەیکا بە شین؟

ئەم کە پەروەردەی سەرمای زستانە
سەر کزەڵۆکەو چاو بە گریانە
نەورۆز نەی دەویست بابان ویران بێ
گۆرانی و شایی، شین و گریان بێ

یان وا کۆست کەوتوو وا بێ نەوا بێ
شانۆی هەڵپەرکێ ی کۆڕی شینگا بێ

نەورۆز دەیەویست گوڵی زەردو سوور
شادی هێنەر بێ بۆ نزیک و دوور!

- بەڵێن بێ منیش بۆ جەژنی ئەمساڵ
جلی سەوزو سوور بکڕم بۆ کەژاڵ

لەسەر پەلکی گوڵ شەونم بباری
بۆی بهۆنمەوە ملەی مرواری

بکەم بە بەریا بەرگی ڕەنگاو ڕەنگ
بێن بۆ تەماشای لە چین وفەرەنگ

بیرازێنمەوە وەک بووکی بەهار
وێنەی نەدی بێ چاوی ڕۆژگار

بچێ بۆ شایی بە شادمانی
بە ئاوازی خۆش بلێ گۆرانی

چ گۆرانی یەک نەغمەی ئازادی
دەنگ بداتەوە دژی بێدادی

بەهار لە زستان تۆڵە بستێنێ
پەیمانی سەهۆڵ بەستن بشکێنێ

کەژاڵ و نەورۆز بە هاریکاری
چەپکێک گوڵی سوور بکەن بە دیاری

نەورۆز حەز دەکا گوڵ بۆ بەهار بێ
کەژاڵ دەیەوێ گەلی ڕزگار بێ!

## لاوی کورد

لاوی کورد دەبێ بسووتێ وەک شەم
ڕووناک کا بۆ گەل ڕێ ی تاریک و تەم

ئالا هەڵگری ڕێ ی ئازادی بێ
مژدە هێنەری خۆشی ، شادی بێ

دروشمی دەبێ تۆڵە سەندن بێ
نابێ لە بیری خۆنواندن بێ

لاوی کورد دەبێ چوست و چالاک بێ
لە کاتی پێویست لە گیان بێ باک بێ

لە کاتی ئاشتی زاناو رابەر بێ
لە ڕۆژی شەڕدا شێری سەنگەر بێ

دەبێ نموونەی خوو و ڕەوشت بێ
کارو کردەوەی بۆ سوودی گشت بێ

هیواو ئاواتی هەر یەکیەتی بێ
دوور لە دوو ڕەنگی، کوردی پەتی بێ

## کۆڵ نەدان

نە خەڵەتام کۆڵم نەدا،
چەند تەلیسم هاتنە ڕێگا

بە وێنەی دێوو دڕندە
بە هەڕەشەو بگرەو بەردە

هەر یەک بە ڕەنگێکی دزێو
هاتە بەر چاوم وەکو دێو

مەرامیان بوو بم ترسێنن
ورە بەردەم بم تۆقێنن

بۆ وتوو وێژیان گوێ دێر بم
چۆنیان بوێ من وا فێر بم

بەڵام ئەم هەموو دەعبایە،
هیچیان بۆ نەهاتە کایە!

وەک کورە کوردێکی نەبەز
ڕێ ی لێ نەگرتم ترس ولەرز!

دا نەچڵەکیم دووا نەکەوتم،
لە چەند هەورازێک سەرکەوتم

هەنگاو بە هەنگاو چوومە پێش
ترسم نەبوو لە زام و ئێش

تا گەیشتمە لێرە وا ڕێک،
هاتنە سەر ڕێم چەند چەکدارێک

دەیانە ویست ڕێم پێ بگرن
بە گوللەی وێڵ جەرگم بدڕن

پێم گوتن: «خزمی خۆتانم
خەڵکی جەزیرە و بۆتانم» !!

هاتمە لاتان بۆ هاوکاری
بچین بۆ ڕێگای ڕزگاری

ئەم چەکەی خستۆتە شانت
بیخە کار دژ دوژمنانت

ئێمە بۆ لەگەڵ یەک دژ بین
دوژمن پەرست و خۆکوژ بین

لە ڕووی دوژمن بیتەقێنین
بێ وەستان خوێنی برژێنین

من وتۆ لای ئەو یەک کێشین
تا زووە ڕیشەی هەڵکێشین

من وتۆ وەک قاو و چەرخین
لەلای ئەو هەردووک یەک نرخین!

ئەمەی بیست کاکی چەک لە شان
وەک شەنگە بێ هاتە هەژان!!

## شەهیدان

ئەی شەهیدانی ڕێگای نیشتمان
خۆتان بەخت کرد کران بە قوربان
لە ڕێ ی ئازادی و سەربەستی ژیان
لە بیر ناچنەوە بە درێژی زەمان
مێژوو دەنووسێ یەک یەک ناوتان

ئەو دەستەی کەوا خوێنی ڕژاندن
ئەو گوللەی کەوا مێشکی پژاندن
ئەو هێزەی هەمووی لە خوێن گەوزاندن
جەرگی هەزاران دایکی سووتاندن
باخێکی دانا نەمامی چاندن!

ئێوە نامرن، نا مرن دەژین
گیانی پاکتان لە سەما و زەمین
بانگمان دەکەن وا بە پێکەنین
دەستی یەک بگرن یەک بن هەموو چین
وا چویتە کەمین دوژمنی لە عین

هەروا خەریکە بە فڕو فیشاڵ
لێکمان تەفریق کا بە پوول و بەماڵ
بۆ ئەوەی یەک یەک بمان نێتە چاڵ
دەستمان ببەستێ وەک تەیری بێ باڵ
تا داگیری کا گەنجینەی حەڵاڵ!

خەیاڵی پووچە دوێنێ بەسەر چوو
میللەت تێ گەیی فڕو فێڵی توو
عەرەب وکورد و مەسیحی و جوو
هەموو یەک نیاز یەک بیرو یەک ڕوو
سەفیان بەستووە بە یەک ئارەزوو

پێکەوە تێکڕا وا هاوار دەکەن
تف لە ڕەوشتی ئیستیعمار دەکەن
نەعلەت لە ڕووحی گشت زۆردار دەکەن
میللەت لە دیلی زوو ڕزگار دەکەن
دیموکراتیەت چاوە نواڕ دەکەن!

کوردە دەیەوێ ژینی سەربەستی
کوردە دەیەوێ نان و پێویستی
کوردە دەیەوێ دەرچێ لە پەستی
کوردە دەڕژێنێ خوێن بۆ مەبەستی
بمرێ ئیستیعمار، کۆنە پەرستی

ئیتر بەسیەتی فیکری عونسری
بوو بە قسەی کۆن سونی و جەعفەری
یەکێتی عێراق بە موختەسەری
پێک هات بە خوێنی ڕژاوی بەری
تێکیشی نادا دەسایس گەری!

کوردە دەیەوێ خوێنی شەهیدان
کێ بوو موسەبیب بخرێتە زیندان
مەحکەمەی بکا میللەت لە مەیدان
حوکم جاری بێ بۆ وان بە خنکان
بمرێ دوژمنی گەل و نیشتمان!!

(١) ئەم هۆنراوەیە لە ڕاپەرینەکەی کانوونی دووەمی ١٩٤٨دا گوتراوە و شاعیر ئەم شیعرەی لە ڕۆژی چلەی شەهیدان لە مزگەوتی گەورەی کۆیەو لە (کەنیشتێ)ی جوولەکانی ئەو شارە خوێندۆتەوە و خەڵکێکی زۆر لە ڕۆشنبیران و نیشتمان پەروەرانی و پیاو ماقوڵانی ئەو سای شاری کۆیە بەشداریی یان لەو کۆبوونەوانەدا کرد بوو.

# چەپکە گوڵێک

١٩٧٧/١/١٨

منی کچە کوردی خاوەن هەست،
شوورەیی یە نەی کەم چیم بێ لە دەست

لە کۆڕی تێکۆشانی خوێنین ڕەنگ
گیان بەخت کەم بە هێمنی و بێ دەنگ

بەتاڕی قژی کاڵم چەپکە گوڵێک
چڵ چڵە بیبەستم وێنەی دڵێک

هەروەکو خاتوو زینی دڵ بەخەم،
بیکەم بە دیاری بۆ سەر گۆڕی مەم

گۆڕی ئەولاوەی کە بە چالاکی،
بەختی کرد بۆ کورد گیانی پاکی

لە پێناوی گەلێکی ماف خوراودا
گەلێکی زۆر لێ کراو و دڵ شکاودا

هەر چیان پێ کرا بەبێ وەستان،
کردیان دوژمنانی کوردستان!

تا نەگەن بە ئامانج هەر چەند پەلەکەن،
نزیک بووە مەرگیان با هەڵەکەن

کە من مردم ئەو ڕۆژە بێ خەم
تەرمم بنێژن لە تەک گۆڕی مەم

سڵاو لە نیشتمانەکەی ژینم،
سڵاو لە یارەکەی دێر ینم!!

ئەوەندەی کە پێم کرا توانیم
کردم وگوتم هەرچی زانیم!!

## بۆ ئازادی کورد

کۆیە: ٨/١/١٩٧٠

ژێر هەر دارێک، سەر بەردێک
سوور بووە بە خوێنی کوردێک

بەم خوێنە وەها نووسراوە،
بۆ ئازادی کورد ڕژاوە

ڕۆژێک ئەم خوێنە لافاوی
دوژمن لوول دەدا گەرداوی

دەبێتە لافاو و شەپۆڵ،
دەگرێتە پێش خۆی دەشت وچۆڵ

خاوەنی ئەم خوێنە سوورە
لاوێکی کوردی جەسوورە!

بۆیە بەختی کرد ژیانی
تا ڕزگار بێ کوردستانی

مێژووی کوردمان کۆن وتازە
لای نەداوە لەو ڕێبازە

ئێستا رابوردوو و داهاتی
هەر خوێنینە بەسەر هاتی

لاوێک لە ڕێ ی نیشتمانی
بەخت بکا گیان و ژیانی

هەر دەمێنێ ناو و یادی
شەهیدی ڕێگای ئازادی

سوور هەڵگەڕا ڕووی گوڵاڵە
ئاودرا بەم خوێنە ئاڵە!

مەسەلێکی زۆر مەشهوورە
کورد عاشقی ڕەنگی سوورە

لەم شوێنەی خوێن زۆر ڕژاوە
گوڵی ڕەنگاو ڕەنگ ڕوواوە،

چەپکە گـــــــولـێک هـەڵ دەبژێرم
لـەکـــاتی خـــۆی بۆی دەنـێـــرم

دەســـــتـــــە گـــــولـێکی ڕازاوە
پێــشـکـەش بـە گـــیـــانـی ئـەو لاوە

ئــــەو لاوەی زۆر بـــــە چـــالاکـــی
بـەخـــشی بـە کـــورد گـــیـــانی پاکی

## بانگەواز

کۆیە: ١٩٦٩

هاواری گـــەلی کـــورد لە کـــوردســـتـــان
بۆ ئـەنجـــوومـــەنی یـەکگرتووی گـــەلان!

وێنـەی بـۆ لـقی مـــافی مـــرۆڤـــان
پێ ی دەڵـێـن (لـیـژنـەی حـقـــووقی ئینســـان)

بیـــست وسێ ســـاڵی تـەواو لەمـــەو بـەر
گـــۆڕ کـــرا فـــاشـــست مرد شـــەیتـــانی شـــەڕ

یاســـای حـــقـــووقی ئینســـان مـــۆر کـــرا
بـانگی ئـاســـایش لـە جـــیـــهـــان درا

بڕیار بوو هەمـــوو نـەتـەوەی جـــیـــهـــان
ئـازادی بـدرێ بـە هـەمـــوو گـــــەلان

ســـەربـەست بێ هـەرکـــەس لـە کـــارو لـە ژین
بێ جـــیـــاوازی لـە ڕەگـــــەز، لـە دین

گـــەلانی ژێر دەست شـــادو مـــەســـروور بوون
بـەم بـانـگەوازە زۆر پشت ئـەســـتـــوور بوون

گـــوتیـــان ژێر دەســـتی و زۆر داری نـەمـــا
قـــەڵای زۆر داری وخـــوێن ڕێژی ڕمـــا

بەپێ چەوانەی هیواو ئارەزوو
خۆزیا سەد خۆزی بە دەوری پێشوو

چەرخی ئەتۆمە مرۆڤ لە گەشتی،
بۆ ناو مانگ دەچێ لە دەورو پشتی!

بیستی گەڵاوێژ ساڵی شەست و نۆ
لە مانگ نیشتەوە کەشتی ئەپۆلۆ

هونەری مرۆڤ مانگی پشکنی
خونچەی لە باخی نهێنی چنی

ئەمجا با بێمە سەر راستی مەبەست
بنووسم بۆتان لە رووی بیرو هەست

لە دوایی رێزو سڵاو بێ ژمار
بۆتان دەنووسم هەر یەک لە هەزار

بۆ ئێوەی بەرێز کە داد پەروەرن
دژی زۆرداری و کاری بێ فەرن

کوردیش گەڵێکە خاوەن نیشتمان
خاوەن رەوشت و رابوردوو و زمان

بەدەست ئیستیعمار بەش بەش کراوە
وەک لاکی مردوو دەوریان داوە

ئەوە هەشت ساڵە هەشت ساڵی تەواو
گەلی هەژاری کوردی ماف خوراو!

لەسەر کەمترین ماف و داخوازی
کار بە دەستانی فاشست و نازی

هەموو کەرەستەی شەڕو شۆڕ و جەنگ
بەکار دەهێنن لەگەڵ زەبرو زەنگ

فڕۆکەی میگ و هەنتەر و هەلوشن
وەکوو کوورەی هەنگ زۆر زۆر بە جۆشن

بۆمبای ناپاڵم زۆر دەهاوێژن
لەوەش زیاتر تیزاب دەرێژن!!

شارو دێهاتمان بۆ مباران دەکەن
ئاوایی و چۆل، چۆل وێران دەکەن

گوند دەسووتێنن بێ تاوان دەگرن
سکی مندالّ و ژنان هەلّ دەدڕن!!

نەک هەر قەنارە جەلّەب بەند کردن
بە زیندوویی چاو مرۆڤ گۆڕ کردن

لە بیست و شەشی ئابی شەست و نۆ
لە ژن ومندالّ شەست و هەشت مرۆ

بڕیار وا درا گشتی بەند کردن
دەبێ بسووتێن ئەوانە کوردن

ژنی هەژارو مندالّی ورد بوون،
تەنیا تاوانیان ئەوە بوو کورد بوون

دژ بە مرۆڤن پەستێن بەد کارن
لەسەرکەوتن دا وەک گورگی هارن

جەنگیز، هۆلاکۆ، تا تەیموری لەنگ
بەم کردەوانە دەلّێن عارو نەنگ!

کوڕی گۆبلز و نەوەی هیتلەرن
دژی ئاشتی و ئاشنای شەڕن

ئەی ئەنجوومەنی یەکگرتووی گەلان
لەسەر شانتانە ئەرکێکی گران!!

ئێستە هەر ئێوە دەستەلاّت دارن
کە پارێزەری گەلی هەژارن!

دژی زۆر دارو دەست درێژ کەرن
دۆستی هەژارو ڕێ نیشاندەرن!

کەوابێ هەتا زوو کەن درەنگە
بۆ ناوی بەرزی ئێوە زۆر نەنگە

چەرخی ئەتۆم و مانگی دەست کردە
تازە بڕیاری قەلاّچۆی کوردە

ئێوەش وەک (عوصبە) گەر چاو بپۆشن!!
لە مافی گەلان چاوتان بپۆشن

ئەگەر زوو دەستی زۆر دار نەبەستن
گەر رابوەستن ئێوەش هەر پەستن!!

## گەشتێک

رۆژێک لە گەشت بووم، لە کۆهسارێک،
لە ژێری سایەو سێبەری دارێک

دانیشتم ئارام، ماندووم سایەوە
سەرم هەڵبڕی ئاورم دایەوە!!

کە تەماشام کرد، پیرە دار بەڕوو
بە شنەی شەماڵ، دەهات و دەچوو

بیرم کردەوە تەمەنی درێژی
گەر لێ ی بپرسم چیم پێ دەبێژێ

گەر رابردووی خۆی بگێڕێتەوە
زۆر نهێنی مان بیر دێنێتەوە!!

گەر لێ ی بپرسم دەنگ بداتەوە
بێ گومان زۆر شت ڕوون دەکاتەوە!

پیرە دار بەڕوو دەنگی دامەوە،
زۆر لە رابردووی بۆ گێڕامەوە!

گوتی: دەوەن بووم کاتێ بووم بە دار
کەوتمە ژێر ترسی چەرخی رۆژگار!!

بۆت بگێڕمەوە گشت بەسەر هاتم
کەم دەبێتەوە لەوەخت وکاتم!

یەکەم ڕووداوێک کە دێتە یادم
بۆت دەگێڕمەوە زۆر پێ دڵشادم

ده هەزار سەرباز لەشکری یۆنان
لەگەڵ گەزنەفۆن هاتنە کوردستان

لەسەر چیاکان بەردباران کران
لە دوای شەڕ وشۆڕ، زۆریان لێ کوژران

بەسەر شکاوی بە ورگی دڕاو
پەرت وبڵاو بوون وەک پۆڕی خوراو

هەزارانی تر سەریان دا لەبەرد
هاتنە کوردستان بوونە تۆز و گەرد

پیرە دار گوتی: ڕۆژێک لە ڕۆژان
لەم دەورو بەرە سووپای جەنگیزخان

ڕۆژێکیش تەیموور، ڕۆژێک هۆلاکۆ
کەوتنە تاڵان و کوشتار و بڕۆ!

ئەم کوردستانە بوو بە گۆمی خوون
کەژو دارستان سووتان بوون بە توون

لێرە لەم کێوە دوژمنی بەدکار
هەڵوەری و ڕژا وەک گەڵای دار

من چەند سووتام هەر ژیامەوە،
چۆنم دەبینی هەروا مامەوە

چیا بەرزەکان کێوانی سەرکەش
نیشتمانی کورد ناکرێ بەش بەش

ئەوەی کورد بخوا زوو دەڕشێتەوە
بۆی هەزم نابێ دەی هێنێتەوە!!

داگیرکەرانی هاتنە کوردستان
نەگەڕانەوە ، چوون بۆ گۆڕستان

کورد هەروا ژیا ، هەروا مایەوە
نا توێتەوە و نەتاوایەوە!!

نە سوڵتان سەلیم، نە شای صەفەوی
نەیان توانیوە کورد کەن سەر نەوی

بۆ ئەم مەبەستە، زۆر کۆششیان کرد
کەوا هان بدەن، کورد لە دژی کورد

بۆ ئەوەی خۆیان بە دڵنیایی
کوردستان بەش کەن بە ناڕەوایی

بەڵام گەلی کورد دژیان ڕاوەستا
ئەم بینەو بەرە، ماوە تا ئێستا

ئێستاش خەریکن کورد بتوێننەوە،
مێژوو بەرەو دوا بگەڕێننەوە !!

خەیاڵیان خاوە کورد ناتوێتەوە
چەرخ بەرەو دوا ناسووڕێتەوە!

## کاوەی سەدەی بیستەمین

دوو هەزار ساڵ لەمەو بەر
هەستا کاوەی ئاسنگەر

بوو بە پێشڕەو و ڕابەر،
دەستی کرد بە شۆڕ و شەڕ

بە هێزی بازوو ومەچەک
نایە سەر شانی کووتەک

دژی زۆر دار ڕاوەستا
سوێندی خوارد بە ئاوێستا

دەبێ زۆر دار بمرێنین
خوێنی بەدکار برژێنین

لەگەڵ لاوانی دلێر،
هێرشیان برد وەکو شێر

قەڵای بەدکاریان ڕماند
خوێنی زۆر داریان ڕژاند

دەرچوون لە دەست بێ دادی
شەکا ئاڵای ئازادی

چوار سەد ساڵ لە پێش کاوە
کە ئاگر هەڵکراوە،

هێزی یەزدان پەرستی
زاڵ بوو بەسەر خوای پەستی

ئاگر ئەوسا هەڵکرا،
بانگی سەربەستی درا!

لەو سا ئاگر یەکجاری
دروشمە بۆ ڕزگاری

پشت بە پشت هەر مایەوە
بە هیچ هێز نە کوژرایەوە

تا کو سەدەی بیستەم هات
پاش هەزاران کارەسات

لە کوردستانی بەرین
کاوەی سەدەی بیستەمین

کاوەی نەمر بارزانی
ئاڵای خستە سەر شانی

شۆڕشێکی بەر پا کرد،
مافی کوردی داوا کرد

داوای مافی ڕەوامان،
بۆمان نووسرا بە تاوان

دوژمن چەند هێرشی کرد
بۆ لە ناوبردنی کورد

گەلی کوردی قارەمان
نە ترسا لە دوژمنان!

بە خوێنی ڕۆڵەکانی،
سووری کرد کوردستانی

هەر ژێر داری سەر بەردێ
سوور بوو بە خوێنی کوردێ

لە ساڵی بیست تا حەفتا،
دوژمن لە هیچ نەوەستا

بە توندی دەستی وەشاند
چەند توانی خوێنی ڕژاند

نەی توانی کورد سەر شۆڕکا
نامەی پەستی پێ مۆر کا!

ناچار خۆی سەری شۆڕ کرد
پەیمانی دۆستیی مۆر کرد!

دانی نا بە مافی کورد
ئۆتۆنۆمی بە یان کرد

یازدەی ئادار بانگ درا
کوردو عەرەب بوونە برا

شەڕو شۆڕ بڕایەوە،
جا ئاشتی گەڕایەوە!!

یازدەی ئادار و نەورۆز
دوو جەژنن هەردوو پیرۆز

نامرن ئەم دوو ناوە
یەک بارزانی یەک کاوە!!

## سروودێکی تازە

ڕۆژێک دانیشتبووم تەنیا
سەرم پڕ بوو لە ماخولیا

لە پڕ برادەرێک هاتە لام
دانیشت و لێی کردم سەلام
فەرمووی دەزانی بۆ هاتم
زۆر لەمێژە بە ئاواتم

کە لێت بپرسم پرسیاری
نەک پرسیاری هەرزە کاری

تکایە لێم دڵگیر مەبە،
لە پرسیارم زویر مەبە

پێم گوت: «کاکە تۆ برادەرمی
لێم بپرسە بەبێ شەرمی

چیت مەرامە چیت نیازە؟
تا بۆت بەیان کەم ئەم ڕازە!»

گوتی: «جاران تۆ بوێژ بووی
شیرین گوفتار و ڕاوێژ بووی

ئێستا بۆ بێ دەنگ وماتی
دوور لە هەموو کارەساتی!

کز و خەمبار و داماوی
لە ژیان هیوا بڕاوی!»

پێم گوت: «کاکە چاک بزانە
من زۆر هیوام بە ژیانە

ئارام بە هێور ببمەوە،
سەر لەنوێ تێ هەڵدەچمەوە

پێت دەڵێم گشت کارەساتم
لەهەموو سەر، بەسەر هاتم!

پێش ماوەیەک لە شەڕ دابووم
شەڕێکی وا تێ گلابووم!!

هێندە توندو دڵ تەزێن بوو
دروشمی هەر مەرگ و خوێن بوو»

ناکاو دەنگێ هاتە بەر گوێم،
بانگی کردم وەهای گوت پێم:

مەترسە من پشتیوانم،
یاریت دەکەم چەند بتوانم!

چیت پێویستە لێم داوا کە
تا پێت بسپێرم ئێستاکە،

من بۆ ئێوە زۆر دڵسۆزم
لە دوژمن دەتان پارێزم

دڵنیا بووم بە بەڵێنی
ئەم زانی پشتم دەشکێنی

کە شەڕ دەستی پێ کردەوە،
دڵنیا بووم دەم بردەوە

ڕق ئەستوور بە قار وقین
دوژمنم هێنابووە لەرزین

بەڵام ڕۆژێکی کتوپڕ،
بەڵێنەکانی بوو بە تڕ،

دەستی هێنا لە تەنیشتم،
خەنجەرێکی دا لە پشتم!!

لەو ڕۆژەوە دەخولێمەوە،
بە زامی خۆم دەتلێمەوە!

گەر نەمردم بەم برینە
ئەمجا ئاکارم ببینە!!

بەکاردێنم بیر و هەستم
سروودێک وا هەڵدەبەستم!

قارەمانی ناو سەنگەر بێ
پێشمەرگەی دەست بە خەنجەر بێ

مووشەکێکی تانک شکێن بێ
هێزێکی دوژمن بەزێن بێ

مێک بێ، میراج بێ، ڤانتۆم بێ
هەڵگری بۆمبای ئەتۆم بێ

سروودێک ناوی تۆڵە بێ
دژی ئەم (شایە) زۆڵە بێ

خودا یار بێ بدا دەستم
دەبێ دوو دەستی ببەستم

ڕقی ئێستا و زۆر لە مێژم
هەمووی هەر پێدا بڕێژم!!

لە چوار چرا دەی دەم لە دار
ببێتە پەندی ڕۆژگار!!

دەری بێنم لە بنە ڕەتی
وەک گۆڕ بە گۆڕی لە عنەتی

ئەمجا سروودێکی تازە،
دەهۆنمەوە بەم ئاوازە!!

مژدە هێنەری شادی بێ
ڕزگاری بێ، ئازادی بێ

ئاشتی بێ، برایەتی بێ
مرۆڤایەتی پەتی بێ

دەست لە ناو دەست یەکتر نانبێ
بەختیاری بێ، ژیان بێ

لە ئازار کەم ئازار تر بێ
لە نەورۆز خۆشی زۆر تر بێ

## رووی سپی کاغەز

رووی سپی کاغەز به نووکی خامه بۆ ڕەش هەڵگەڕا
دوو زمـــانی هاته کـــارو نامـــه ســـەر بەرگی دڕا

بۆیه گـــشت ڕازو نهـــێنی دڵ به جـــاریێ هاته ڕوو
شـــەو له نیوەی تێپـــەڕی خـــەتی بەیان بوو ئاشکرا

شـــەونمی فرمـــێسکی بولبـول وەک ڕژا سەر پەلکی گوڵ
خـــونچـەی لێـــوی کـــردەوه وەک پێکەنی ئابرووی تکا

سوێند به ئاوێستا ده خوا پەروانه خۆی زەردە شتی یه
بـۆ پـەرســـــتگا دەچێ، وا ڕوو بـه ڕوونـاکـی چرا

نەزمی ڕێک و پێک و ســاف ووردە وێنەی شـەو چراغ
کـێــشی ســووکـه، نرخی زۆره، تا بـه تایه کـێـشـرا

هەنگی دڵ وەک نیشـته سەر خونچەی دەمت تا بیمژێ
شـــانەیی هەنگوینی هەڵبـــەست و گـــولاوی تێکرا!!

## نەی ژەن

گـــویێ له نەی بگره کـــه نەی ژەن فـــوو دەکـــا
ڕاست دەبێـــــژێ بـاسی ڕابـردوو دەکـــــا!

پـێت دەڵـێ: ئـەم ڕۆژگـــــارەی بێ وەفـــــا
ڕوو ڕەشـــێکه هەر شـــەوێک ســـەد شـــوو دەکـــا

کـــــامـــــیـــــرایێکی له دەست وەک وێنەگـــــر،
پـێـــــچـــــەوانه ڕاســـــتی ی ئـاوه ژوو دەکـــــا!

چاکـــــه هوشـــیـــــار بی نەکـــەوی یه داوی ئەو
بێ گـــومـــان تۆیش چەشنی خـۆی بەد خـــوو دەکـــا

تیـــــخی بۆ چاکـــــه کـــوله هیچ نابڕێ
بۆ خـــــراپی هێنده تیـــژه مـــوو دەکـــا

ئاشنا نابێ بەکەس تا ئەو کەسەش
هەروەکو خۆی سووک و بێ ئابڕوو دەکا

بێ شەنە ئەیداتە دەم با کاو دان،
وەک سەپانێک گشتی تاوو توو دەکا

خۆی دەپارێزێ هەمیشە ئەو کەسەی
وەک موتالای لاپەڕەی مێژوو دەکا

عیززەتی نەفس و کەرامەت سەروەتە،
ناوی چاکە مردووان زیندوو دەکا!

ڕێگەیێکی بێ پەناو پێچ بگرە بەر
پیاوی مەرد لەو ڕێگە هاتوو چوو دەکا

بەد ڕەوشتی ڕوو بە وێرانکاریی یە
کوندە بۆیە خاوەنی کوو کوو دەکا

ئەم جیهانەی سپڵە پەروەر ئاوسە
هەر بە دەنگی ئاخ و ئۆف بێزوو دەکا

خوو ڕەوشتی بەرز و یەکبوون بێ گومان
ڕێ نومایی چینی دا هاتوو دەکا!!

## گوڵزاری ئەمەل

١٩٨٧/٢/٦

لە گوڵزاری ئەمەل خونچەی نە پشکوتوو کە پشکۆ کا
دەبێ هەر کەس وەکو بولبول لە گوڵشەن لانە بۆ خۆ کا

ئەگەر ڕۆژێ بەهاری شادی ڕووی کردە گەلا ڕێژی
دەبێ حاڵی چ بێ ئەو کاتە بولبول قوڕ بەسەر خۆ کا

کە ڕستەی داوی بەدناوی لەدەست و پێ گرێ داوم
دەترسم من لە ئاخیردا حەواڵەی تیغی ئەبرۆ کا

بە بیرم دا نەهات ڕۆژێ کە چەرخی ڕۆژگار وایە
ئەوەی سەردانەوێنێ بۆی دەبێ کالای لەبەرخۆ کا

ڕقی لێمە ڕەقیب وا لێوی دەکرۆژی لە داخانا
بە وێنەی ئەهریمەن با تۆقی بەدخۆیی لە ئەستۆکا

دەمێکە بەختی بەرگەشتە لە تاریکی شەوا خەوتوو
دەبێ هەستێ لەخەو ئیتر بەسە ڕووی خۆی لە ئاسۆکا

کە پێویستم بە دڵسۆزێکی زانای کوردی لێ زانە
هەموو بیرێکی دژ یەک بوون لەناو یەک بۆتەدا کۆکا

ئەوەی هۆ هۆ دەکا هیچ کاتێ من پێ ی دڵنیا نابم
کەسێکم خۆش دەوێ مەرد بێ هەمیشە حەز بە کۆکۆکا

## بەد ڕەوشتی

بەد ڕەوشتی و نا جوانمەردی چ زوو ساندی ڕەواج
گەر لە بۆ نانیش نەبێ هەر باوە ڕوو کردن لە ساج

زۆر جیاوازی لە ئێستا و دەوری ڕابردوو هەیە
تاج لە بۆ سەر بوو، بەڵام ئێستاکە هەر بۆ پێ یە تاج

ئەو کەسەی دوێنێکە داوای تەختی پاشایی دەکرد
ئیمرۆ سەد کرنووش دەکێشێ، بیکەنە مەئمووری باج

پێ لەسەر نان و جوێندانت بە زانا یانی خۆت
تف لە ڕووی خۆ کردنە وەک لەعنەتی ڕاهیب لە خاچ

هێند بە نزمی وا سەری خۆی نایە ژێر پێ ی دوژمنی
قەت لە بازاڕ نافرۆشن شت بە پوولی نا ڕەواج

ڕووکەشی پاقڵ بکا وەستا مەحاڵە ببتە زێڕ
ئەو کەسەی نا مەردە هەر نا مەردە بچتە بورجی عاج

کۆنە بارگیر چۆن دەبێتە ئەسپی تازی ئەی نەزان
ڕەخت و زین هەرچەند بگۆڕێ چی دەکا وەستای سەراج

## بۆ مەرگی خوالێ خۆشبوو
## ئیدریس بارزانی

گـوێم لە ڕادیۆ گـرت بوو تا هەست بکەم دەنگێکی خـۆش
خـسـتـیـە بەر گـوێم کت وپڕ دەنگی پڕ سـۆز و پەرۆش

دەنگی مـەرگی خـۆشـەویسـتـێکە لە بیـر ناچێـتـەوە
هەر کە بیسـتم هێندە دڵگیر بووم نەما لام هەست و هۆش

ڕۆژگـار ڕووت سـوور نە بێ هەروا بەشت بێ ڕوویی ڕەش
ڕوو ڕەش و دڵگیـر و پەست بی هەر بە ئازار و نەخـۆش

خۆت نەگرت ڕۆژێک بە باسێکی کەمێک دڵ خـۆش بکا
غـەیری گـریەو شـیـوەنێک هەسـتی مـرۆڤ بێنێـتـە جـۆش

ڕۆژی«سی و ئێکی کـانوون» نۆ سـەدو هەشـتـاو حـەوت
هەر کـە بیـسـتم ڕاچەنیم لەرزیم و کـەوتم چووم لە هۆش

ڕێم ببێ دەسـتـە گـوڵێک بەسـتم لە بۆ سـەر گـۆڕەکـەی
پێ ی بڵـێم تۆ نامـری ناوت دەژی ژینێکی خـۆش!

## بەر لە خۆر کەوتن

بەر لـە خـــۆر کـــەوتن بەیانی چوومـــە بـاغ
تـاوەکـــو بولبـــول بدەم زاخی دەمـــاغ

یـادی ڕەنـگ و ڕووی نـیـگـارێکـم دەکـــــرد
بۆ شـەوی تاریک ببـێـتـە شـەو چراغ

نێـرگـزی چاو مـەست کـە فـرمـێـسکی ڕژاند
لالـە سـوور بـوو نـایـە دڵ سـەد دەردو داغ

سـووسنی ڕوو سـوور کـە لێـوی کـردەوە
هەر وەکـو زاری شـەقـایق ڕوو لـە بـاغ

هات وەکو مەستان سوراحی گرتە دەست
بوو بە مەی گیرخستیە سەر پەنجەی ئەیاغ

هێندە سەرکەش بوو بە جوانی ڕەنگ و ڕوو
چەند هوزاری خستە سەر کاسەی فەراغ

ڕیزی بگرە کاتی لاوێنی جەوان
نامە هێنەر چی هەیە غەیری بەلاغ

گەشتی دەریا بێ گومان سوودی هەیە
ترسی زۆرە کەسبی لەعل و شەو چراغ

پیاوەتی تا ڕەنج نەدەی دەست ناکەوێ
شەوقی نابێ خۆی نەسووتێنێ چراغ

## کرداری فەلەک

هەرچی کردی لەگەڵ ئێمە، بە نەزانی بوو فەلەک،
دەستی بەستم منی دا، دەست عەجەم و تورک و وەلەک

کەرو گا حاکمی غاباتە، لە جێ ی شێر و پڵنگ
چەقەڵ و ڕێوی گەڕیش، خۆ دەفرۆشن بە دەڵەک

لەعل و مرواری و یاقووت، هەموویان بێ برەون
مس و پاقڵ بوونەتە، زێڕی خولاسەیی مەحەک

ڕاستی بە جارێ گوم بووە، نای دۆزی یەوە بێ سوودە
برەوی سەندووە دەست برین و فربوو فێڵ و کەڵەک

ڕاستی وا پشتی چەماوە بووەتە گۆشی کەوان
خوارو خێچیش بە خسوسی دەکەنە دۆخی خەڕەک

ئەمرۆ ڕۆژگارێکە هەموو خوو ڕەوشتمان گۆڕاوە
داد لە بێ دادی یەوە هاتووە، یاسا و قانون لە کوتەک

(عەونی) نەکەی بێزار بی تۆ، هەر یادی بکە ڕابردوو،
دڵ مەگۆڕە، نەوەک ڕۆژێ لە پڕێک بێتەوە نەک!

## خودایە

خودایە تۆ دروستت کرد سروشتم،
لە خوانی نیعمەتی تۆ پێگەیشتم!

نی یە چاکەم لە بۆ ڕۆژی حیسابم،
کە لوتفی تۆ نەبێ من بەد ڕەوشتم!

بە بێ هوودە ژیانی خۆم بەسەر برد
لە بێ بەختی درەنگ من تێگەیشتم!

لە تاوان ئەسپی خۆم لینگ دا بەبێ ڕێ
سەراسیمە (١) کە وێڵی چۆڵ و دەشتم!

پەنا بۆ کوێ بەرم بێ سوودە ئیمڕۆ
لە زۆری کردەوەی نارێک و زوشتم*!!

لە بەدکاری و بەد خوویی ی ڕەوشتم،
لە ژێر باری گوناها کۆمە پشتم!

شیاوی ئاگری دۆزەخ منم من
بە ڕەحمی خوا هیواداری بە هەشتم!

کە هۆی بەد بەختی خۆت هەر خۆتی (عەونی)
مەڵێ وابوو لە ئەووەل سەر نویشتم(٢)!

(١) سەراسیمە: بە پەلە.
(*) زوشت: خراپ
(٢) سەر نوێشت: قەدەر. بەسەر هات.

## ئەگەر من

ئەگەر من تاجی پاشایی لەسەر کەم،
وە یا خود بەرگی دەروێشی لەبەر کەم

جیاوازی چی یە بۆ مەرگ و ژینم،
کە وایە بۆچی خۆم تووشی کەدەر کەم

بخـــوازم گـــەر لە گـــێـــتی بەهرە مـــەند بم،
دەبێ خـــۆم هۆگـــری فـــەزل و هونـەر کـــەم!

جـــوان مـــەردی و ڕەوشـــتـی چاک پەســـەندە
بە چاکـــە لازمـــە خـــۆم بەهرەوەر کـــەم

دژی بـــەدکـــــــــار دەبـــێ دژبم بـــە تـــونـدی
ئەگـــەر من خـــزمـــەتی جنسی بەشـــەر کـــەم!

پەنـا دەگـــرم بە خـــوا ، خـــوا یاری دەربێ
لە دوو گـــێـــتی دەبێ خـــۆم بەخـــتـــەوەر کـــەم!

## گەرمی ئەتۆم و سۆزی دڵ

نیـــسـبـــەتی گـــەرمی ئەتۆم تێکەڵ بە ســـۆزی دڵ دەکـــەم
گـــەر بگریەم هەر بە لافـــاوێک جـــیـــهـــان کـــاول دەکـــەم

ڕەنگی گوڵ سوورە لە ڕوو سووریی کـچـێکی کـورد دەکـا
دوور لە مـــیـکـیـــاج ئارەزووی چاوی ڕەشی بێ کل دەکـــەم

داوی ئاڵۆزاوی زولفـــیـــم دیت لە دەوری خـــاڵی ڕوو
ترس و لـەرزی زۆرمـــــە لـەم داوو دانـە سڵ دەکـــــەم

بۆ گـــولی هیـــوایە هەردەم ئاه و ناڵـەم بێ وچان
وا مـــەزانن بولبـولم مـــەیلی گـــوڵی ســـەر چڵ دەکـــەم

دولبـەری دڵخـوازی من هەر نیـشـتـمـانە نیـشـتـمـان
گـــەر خـــودا دەســـتـم بدا دەســـتی لە شـــان و مل دەکـــەم

قـەت لە مـەولا ڕێ هەڵە و چەوت و چەوێڵ ناگـرمـە بەر
گـــوێ لە بۆ گـــشت پەند و ئامـــۆژگـــاری زانا شل دەکـــەم

تف لە ئاکـــارو ڕەوشـــتـی دۆســـتـی گـــەوج و هیـچ نەزان
من هەمـــیـــشـــە ئافـــەرینی دژمنی ئاقڵ دەکـــەم!

گـەر لەگـەڵ بەدکـار و بەد بین دا بگونجـێم بێ گـومـان
زێڕی قـاڵ و خـالیـسی خـۆم تێکەڵی پاقڵ دەکـەم!!

## یەکبوون (۱)

ئێستە من پیر بووم وشوێن دڵداری لاوی ناکەوم
ڕێ سەرەو هەورازە بۆ خۆم تێ دەگەم سەر ناکەوم!

دوای هەموو زانست و تاقی کردنەوەم ماوەی ژیان
من بە هاندانی ئەم و ئەو تازە هیچ تێ ناکەوم

من بەڵێنم داوە تا ماوم بەسەر بەرزی بژیم
گەر سەرم بڕوا لە ڕێ دا قەت لە ژێر پێ ناکەوم

تەندروستیم هەر نی یە ئیمڕۆ مەترسی مەرگمە
تاکو دوژمن شاد نەبێ بۆیە لەسەر جێ ناکەوم

نۆش دارووی دەردی گشت یەکبوونە دەیزانین هەموو
گەر هیوا داربم بە یەکبوون شوێن ئەم و ئەو ناکەوم

ئاشنا گەر نەم کوژێ ترسم نی یە نا ئاشنا
با هەمیشە گوللە بارانم بکا پێ ی ناکەوم!!

خۆشە نەمرم تاکو ڕۆژێ خۆم بە سەربەستی دەدی
بشمرم باکم نی یە ئەو ساکە شوێن سوێ ناکەوم

(۱) ئەم هۆنراوەیە لە گۆڤاری کاروانی ژمارە (۸۸)ی ساڵی ۱۹۹۰ دا بڵاو کراوەتەوە.

## برایان

برایان، ئاشنایان، دۆست ویاران
دەناڵێنم وەکو هەوری بەهاران!

لە سۆزی سینەو جەرگی بڕاوم
کە خوێن سەرکا لەچاوم عەینی باران

مەکەن لۆمەم کە بێ ئارام وسەبرم
وەکو شێت گەر بکەومە کۆهساران!

نەبینن ئێوە قەت مەرگی عەزیزان
نەکەن شێوەن لەداخی کۆچی یاران

کەسێک گەر موبتەلا بوو بەم بەلایە
هەتا دەمرێ مەحاڵە شادی جاران

تیماری ناکرێ زامێکی سەختە،
بەسەد هاوین و زستان و بەهاران

خودایە خۆت بکە ڕەحمێ بە حاڵم
کە ڕەحمی تۆیە چاری دەردە داران

کە دەردی مەرگ نەبوو هەرگیز عیلاجی
لە هیچ چەرخ وزەمان و ڕۆژگاران!!

لەبو فەرمانی حەق سەردا نەوێنە،
کە (عەونی) بچی یە ڕێزی هەرزەکاران!

## فەلەک

فەلەک پابەندی کردم هەم شکاری ناکەسی کردم
مەحەببەت غەدری لێ کردم دوچاری ناکەسی کردم

عەجەب قیسمەت هەڵی گرتم بە چۆڵ و بادیەی عەشقا
بە ناکامی چلۆن تووشی دیاری ناکەسی کردم

زمامی دڵ بەدەستی من نەبوو چ بکەم رەفیقانم
ئەزەل تەقدیری وا بو تەفرەخواری ناکەسی کردم

## باری خەم (١)

لە ژێر باری خەمت ئەی سەروو قامەت قامەتم نوونە
لەسەرما سایەیی سەروی قەدت بۆچی لەکەم بوونە

چ بوو تاوانی فەرهاد پێم بڵێ ئەی شیرینی ئەرمەن
دڵۆپی خوێنی ئاڵی ئەو گوڵاڵەی کێوی بێستوونە

ئەگەر لەیلا بە هۆی مەجنوونەوە مەشهووری عالەم بوو
لە سایەی عشقی لەیلا دەشتی نەجدیش قەسری مەجنوونە

وەکو یەعقووب لە گۆشەی خەم نشینی کەوتووم هەردەم
بە هیوای مژدەییێکی ئەو کەسەم لێم بێ سەرو شوونە!

(١) ئەم هۆنراوەیە لە جێ ی خۆی حەوت دێڕ شیعر بووە، بەڵام ون بووە و کە دۆزراوەتەوە تەنیا ئەم چوار دێڕە چنگ کەوتووە.

## ئاشنایێکم هەبێ

ئاشنایێکم هەبێ لەم عالەمە تەنیا غەمە
ماڵی ئاوابێ وەفاداری وەها ئەمڕۆ کەمە

هەمدەمی ڕۆژ و شەوانم هەر ئەوەو هەر ئەو دەبێ
ئەو نەبێ من بێ کەسم قوربانی بێ هەرچی هەمە

هۆگری شادی نەبووم قەت بۆیە ڕووناکاتە من
من دڵی خۆم دا بە غەم شادی لەوێ نا مەحرەمە

موبتەلای دەردێکی وا بووم لە دەردی میللەتم
پێکەنیم گریەیە، خۆشیم هەمووی هەر ماتەمە

من کە کوردم عیززەتی نەفسم ئەبەد لێم ناگەڕێ
خزمەتی بێگانە کردن لام شتێکی ئەستەمە!

مردنم لا خۆشترە سەد جار لە ژینێکی کەوا
وێڵ و ئاوارەی وڵاتان بم وەکو ئێستا هەمە

پادشایی بۆچی یە گەر ژینی دەرویشی ببێ
گۆشەیی کونجی قەناعەت من لەمەو دوا جێگەمە

ئەو فریبی خوارد بوو بۆیە لە جەننەت دەرکرا
هەرچی تاوانێکی من دەیکەم لە ئەستۆی ئادەمە

(عەونی) هوشیار بوو نەکەوتە داوو بەندی ڕۆژگار
خۆ فرۆشتن ئیمڕۆ زۆر باوە بەڵام نرخی کەمە!!

# به توندی پێ مەنێ

به توندی پێ مــەنێ ســەر خــاک و ئەندامی نیگارێکە(١)
نەکـەی پێ ی دا بڕۆی چونکه له جـەسـتــەی چەند هەزارێکه

به ســووکی تێ مـەگـه ئەم خـاکــه لاتان زۆر به قــیــمـەت بێ
هەمــووی هەر خـــاکی دەست وپێ و چاوو لێـــوو زارێکه

ئەگــەر تۆهەڵکەنی ســا ناو دڵی خــاک بۆت بەدەربێــخی
چ جــێگای ئاوەدانی بێ، چ جــێگای شــوێنه وارێکه!

ئەگـــەر بێـــتــو به چاوی دڵ ســەرنج بگری دەزانی تۆ
کــه شــار وێران بووه وێرانەیه ئێـســتــاکــه شــارێکه!

هەمــوو جێ شــانشــینه ئێــســتــا وا خــانووی هەژارانه
هەمــووی کــوختی هەژاره، ئێــســتــه قـەسری شەهریارێکه

دروســتی کــردووی وا ئافــەریدگــار(٢) چــی دەزانــی تــۆ
ســـروشــتت پادشــایه، یان گــەدایه، یان هەژارێکه

ئەوەی هۆگــر ڕەوشت و خـــوویی چاک بوو چاکی لێ زانی
له دوو گــێـتی بەڕاســتی به خــتــیــار و بەخــتــیــارێکه!

مــەبه بایی به دارایی جــیــهــان ئەم پیــره مــەکــرۆیه
ئەگــەر قــەندت لەدەم کــا بێ گــومــان هەر ژاری مــارێکه

به هیــوای شــادی و خــۆشی له گــێــتی دوور له زانینە
ئەوەی شــادی دەبینێ لێ ی بپــرســـه دەرده دارێکه

شەوو ڕۆژ، مانگ و خۆر، دەریا و زەوی ، چەرخ و فەلەک گشتی
ئەتۆ بڕوا بکه(عــەونی) کــه کــاری کــرد گــارێکه!!

(١)نیگار: یاری جوانی خۆشەویست
(٢) ئافەریدگار: خالیق، خودای گەوره

## ئەو دەمەی(١)

ئەو دەمـەی دڵ بیـر و یادی پەرچەم و روخسـار دەکا
ڕێ ی(خەتا) دەگرێ دەچێ بۆ چین لە عەنبەر بار دەکا

چاوەکـانی مـەسـتی نازن شـەرِ فـرۆشن نازەنین
هەر بە ڕەمـزێکی تیمـاری سەد دڵی بیمـار دەکـا

ئەو دەمـە تۆ پێکەنی دڵ ڕاچەنی ئەوسـا گـوتم:
حەقیەتی بولبول کە مەشقی گوڵشەن و گوڵزار دەکا

تا لە شـەودا هەڵ نەگیـرسـا وەک چرا روخسـاری تۆ
نەقـدی پەروانەم دەکـرد بۆچی لە رۆح بێـزار دەکـا

(١) ئەم غەزەلە لە جێی خۆی دا حەوت دێڕە شیعر بووە، بەڵام ون بووە و هەر ئەم چوار دێڕەمان چنگ کەوتوەتەوە.
(٢) خـەتا: ناوی کـۆنی ناوچەکـانی باکـووری وڵاتی چینە بە موشک بەناوبانگە.

## پارچە شیعرێکی
## ئەبولعەلای مەعری(١)

لـە لا زقـــــیـــــە شـــــەڕو هـەرا بـوو،
لەنـاو گـــاورو ئـیـــســـــلام بەرپا بـوو!

یـەک بـە زەنـگـوڵـە لـێ دان خـــــەریـک بـوو
یـــەک بـانـگـی دەدا هـەســتن نـوێـژ ڕابـوو

هەر یەک ئایینی خـــۆی پەســـەند دەکـــرد
خـــۆزیا دەم زانی کـــامـــیـــان ڕەوا بـوو؟!

ئەبولعـەلای مـەعـەری: شـاعـیری ناوداری عـەرب، لە نێـوانی ساڵانی (٩٧٣-١٠٥٧)ی زایینی دا ژیاوە، گـەلێک شـیعـری فەلسەفە ئامێزی داناوە.

## چەند سلێمان هاتن

زولفی پەخشان کرد لە ڕووی دولبەرچ داوی نایەوە
لەم هەرێمە هەر دڵێک ئاوارە بوو پێچایەوە!

ئەی دڵی زارو نەخۆش سەد ئافەرین بۆ چاوەکەی
وەک مەسیحا مردوویێکی گیان بە بەر هێنایەوە

چەند سلێمان هاتن و فەرمانڕەوا بوون سەردەمێ
ڕۆژگار ئەو سەر گوزشتەی یەک بە یەک گێڕایەوە

دژ مەوەستە هەرچی ڕووداوێک زەمان هێنایە پێش
گەر مەبەستت بەرژەوندیی گشتە بێتە کایەوە!

کافری دڵ ڕەق هەژارێکی وەها چی کردبوو
بۆچی کوشتت وا بە زاری چەندی لێت پاڕایەوە

چەندەها گرتیانە بەر ڕێگا بەرەو ئاوی حەیات
نەی گەیشتێ کەس هەتا ئێستا کە پێ ی نەخورایەوە

دەستی پێ کرد نم نمەی بارانی رەحمەت دای ڕژاند
هەرچی تاونێکی ئادەم کرد بووی شۆرایەوە!!

## فریشتەی ئاشتی

با دەری کەین ئەهرەمەن، شەڕ خوازی دوور بخرێتەوە
با فریشتەی ئاشتیمان پێشوازی لێ بکرێتەوە!

با جیهان بخرێتە ژێر سێبەری باڵی هوما
ئاگری شەڕ دا بمرکێت خوێن ڕژان ببڕێتەوە

لەم جیهانەی وا بەرین هەرکەس بە ئازادی بژی
هەر گەلێ مافی خوراوە مافی زوو بدرێتەوە

با دروشمی خۆشەویستی و برایەتی یەک هەڵگرین
هەرکەسە ئازاد لە خاک و مەرزی خۆی بخولێتەوە

نرخی ئەم ساروخ و تۆپ و گوللە و بۆمبای ئەتۆم
هەر لە کیسەی چەند کەسێکی پیسە کۆ دەکرێتەوە

با لە جێگای نرکەیی تۆپ و تەق و تۆقی تفەنگ
بەزم و هەڵپەرکێ و گۆرانی لە جێ ی بکرێتەوە!!

## پشت بە کێ بەستم

پشت بە کێ بەستم کە بڕواییم بە هیچ لا یێ نی یە
گوێ لە چی بگرم کە دەنگی من لە هیچ نا یێ نی یە

هۆشی خۆم گەر دەربڕم تاوانە دەم کوت چاترە
دادگایی داوەری ئیمڕۆ لە دنیایێ نی یە

من لە ئەنجامی بەسەر هات و هەڵەی خۆم تێگەییم
گەر لە بۆشایی نەبێ شاییم بە هیچ شایێ نی یە

ماف و دادو ڕاستی گەر ڕاستت دەوێ هەر سێ درۆن
گەر هەبێ بۆ دەست بڕان ئاسایە یاسایێ نی یە

(سوورەتا) بێ و(تا ڕەشە) بۆ من جیاوازی چی یە
من لە ترسی (سێبەڕۆ) ئاگام لە هیچ تایێ نی یە

## یاسای سروشت

هەموو سۆزی دەروون هەست وئەڤینە
دڵی دڵدار کە کوورەی ئاگرینە!

ئەمە یاسای سروشتی ڕۆژگارە
لە ئادەم تاکو ئێستا چین بە چینە!

نەکەی لەم ڕۆژگارە دڵنیا بی
بە ڕاتی ژان و فرمێسک و گرینە!

کەسێک هۆگر نەبوو بۆ بەد ڕەوشتی
شیاوی ڕێزە، جێگای ئافەرینە

لە بۆ چاکە کەسێ گیانی بەخت کا،
سولەیمانێکە خاوەن سەد نگینە!

گومان ناکەم چ تاوانم هەبێ من
زەمان بۆچی لەگەڵ من وا بە قینە؟!

لە زیندانی ئەڤین هەر کەس وەکو مەم
کە بەندی داوی زولفی خاتو زینە

بە یادی چاوی لەیلا بۆیە مەجنوون
کە چۆلی نەجدی لا وەک شانشینە

ئەوەی دڵداری بۆ خوّی کردە پیشە
چ دەر بەست شین و شایی و مەرگ و ژینە

نە چی بۆ دیتنی دولبەر لە شەو دا
ترسناکە هەمووی بۆ سەو کەمینە!

لە لووتکەی بەرزیا هەرکەس کە سەر کەوت
گومانی ناوێ دوایی دا بەزینە

ئەوەی رۆژێک لە ژین دا پێکەنی بێ
سزای ئەولای کەمی سالێک گرینە!

## ئەگریجە(١)

ئەگریجەو پەشمینە لەسەر کولمە کە لاچێ
رۆم و عەجەم و عوربە هەمووی قیمەتی ماچێ

بۆ تەرکی وەفای هێندە جەفای دام کە بناڵم
عەشقی لە دڵم سابیتە زۆر زەحمەتە لاچێ

دەی فەرموو گوڵم هەر کەسی بەدگۆ و عەدوومە
یا رەب لە جیهان هەروەکو (عەونی) بە فەناچێ

(١) ئەم پارچە شیعرە هۆنراوەیەک بووە لە ناو چووە و تەنیا ئەم سێ دێڕەی چنگ کەوتۆتەوە.

## بەرزەوەندی

قەدو باڵایی شۆخت بێ بەڵا بێ
کەسێک گەروا نە بێژێ بەر بەڵا بێ

لە چاو وزاری بەدکاران بە دوور بێ
لە ژێر سایەیی باڵی هوما بێ

ئەوەی خۆشت نەویست دژ بەو دوعاکە
بەدەردی خود پەسەندی موبتەلابێ

ئەوە مەردە هەموو دەم دژ بوەستێ
لە هەر بڕیار و کارێک نا ڕەوا بێ

لە پێناو بەرژەوەندیی ئادەمیزاد
مەبەستت هەر ڕەزامەندیی خودا بێ

ڕەوشتی بەرزو هۆگر بوون بە چاکە
لە ماوەی ژین کەسێک پێ ی ئاشنا بێ

ئەوە پاداشتی کرداری پەسەندە
لە تاریکی شەوا شوعلەی چرا بێ

ئەوەی ئاژاوە خوازو بەد ڕەوشتە
هەموو دەم بەندی زیندانی سزا بێ

## بە یادی لاوێتی

وەرە مەی گێڕ لەمەی ڕەنگ ئەرخەوانی
بە یادی ڕۆژی لاوێنی و جوانی

بە یادی ڕۆژگارێکی بەسەر چوو،
کەوا پڕ بوو لە خۆشی و کامەرانی

بە یادی ئەو دەمەی ئێوارە وەختان
بەرامبەر باخەکەی ئۆمەر خوچانی(١)

بە یادی ئەو دەمەی کۆڕی هەڤاڵان
بە گۆرانی و بەستە و نەغمە خوانی

لە کاتێک دا نسێ(٢) باڵی دەکێشا
بەسەر باخ و چەم و ڕووبار و کانی

لەسەر گردی (جووان) ئەمجا بەرەو شار
بە شادیی و بە ختیاری و کامەرانی

لە ماڵێک دا بە کۆمەڵ دا دەنیشتین،
بە بەزم و شادی تا کاتی بەیانی

نەکەی دڵگیر ببی گەر لێت بپرسم
لە کوێن ئێستاکە یارانی گیانی

بە خوا سوێندت دەدەم ئێستا لە کوێ یە
بە ڕاستی پێم بڵێ: گەر هیچ دەزانی

وەڵامی دامەوە مەی گێڕ گوتی پێم:
گەلێک دڵگیر دەبی ڕاستی بزانی

برایان، ئاشنایان، دۆست و یاران
کە ڕوویان کردە دنیای جاویدانی

لەوە دڵگیر مەبە یاسای سروشتە
کە کەس ڕزگاری نابێ چاک دەزانی

کەسێک گەر حەز بکا ناوی بمێنێ
بە چاکە بەخت بکا ماوەی ژیانی

لە پێناو ئادەمی زادا بە گشتی،
بە تایبەت بۆ گەل و بۆ نیشتمانی

# له پێناو خۆشەویستی

له پێناو خۆشەویستی و میهرەبانی
دڵم دابوو سەریشم نایە بانی

قەڵەم مەرجم هەیە گەر پێت بنووسم
دەبێ واز بێنی بەس کەی دوو زمانی

ڕەقیبیش خۆی مەڵاس دابوو له پەنهان
هەتا رازی نهێنی دڵ بزانی

منیش بۆیە لە ترسی چاوی بەدکار
لە تاریکی شەوا چوم بۆ ژوانی

لە سەر چڵ دا لە گوڵشەن بۆ گوڵی ڕووی
کە شەوگاری درێژم تا بەیانی

مەبا دا دەستی بەدکاری بگاتێ
بە ئەرکی خۆم دەزانی پاسەوانی

بەڵام ڕۆژێک لە ناکاوا کت و پڕ،
هەڵی کرد باو بۆڕانی خەزانی

گەڵاڕێزان و گوڵ با بردی، بولبول
بە ناچاری بە جێ ی هێشت ئاشیانی[1]

دەبێ من سەرپەرشتی باخەکەم کەم
لە کاروباری مەرجی باخەوانی

بە دەستووری سروشت گەر دڵنیا بین
لە پاش ناخۆشی یە دێت شادمانی

(١) ئاشیان: هێلانه

## بێ وەفایی

سەری هەڵداوە شێوەی بێ وەفایی
نەما لای کەس نیشانەی ئاشنایی

دەبێ مل کەچ بکا ئیمڕۆ هونەرمەند
لەبەر دەردی هەژاری و بێ نەوایی

ئەوانەی بەهرەمەندن تاکو ماون،
لە بەندی خەم کە نا بینن ڕەهایی

کەسانێکی نەزان و هەرجو مەرجن،
لە ڕیزی پێشەوەن بۆ ڕێ نومایی

بنووسێ شاعیرێک هەڵبەستی هەر چەند،
کە دڵ پڕکا لە شادی و ڕۆشنایی

بە پوولێ نای کڕن ئیمڕۆ لە بازاڕ
هەزار حاجی و وگۆران و وەفایی

کە دەنگی هاتە گوێم فەرمووی برادەر
بڕۆ ئارام بە مەگرە ڕێ ی جودایی

کە مرشد حەز بکا با ڕەش بەڵەک بێ
دەبێ شێخ بگری خۆی سەر چۆپی شایی

وەرە عەونی من و تۆ لێرە دەرچین
کە هەرگیز ناگرین ڕێ ی ڕووسیایی

## گۆرانی بێژێ

گۆرانی بێژێ گەرەکمە نایێ
بچڕێ قەتارێ خاوکەر نەوایێ

یان هۆرەی جافی یان ئەڵڵا وەیسی
لاوک، حەیرانێ، ڕاستێ، سەبایێ

دەشتێ، پایزێ، سوارۆ، سەحەرێ
بەیات، ماهووری، شۆڕێ، سێگایێ

شمشاڵێ، زیلێ، عوودێ، کەمانێ
نەیێ، بلوێرێ، پیکی زوڕنایێ

یارێ، دولبەرێ، شۆخێ، نیگارێ
فرشتە خوویێ، پەری سیمایێ

خاتوو زین ڕەنگێ، شیرین شێوەیێ
کاکە مەم ڕەوشت، فەرهاد ئاسایێ

کۆڕی نەی ژەنێ، مەیێ، مەی گێڕێ
بە زمی سەیرانێ، سەیرێ، سەفایێ

شەوێکی تارێ، ڕێ ترسناکێ
خوداوەند سا زوو هەڵکەی چرایێ!!

## بای شەماڵ

دڵ بە ئازارە هەمیشە کە دەکا داد و بڕۆی،
خەمی یاری بە هەزار خستوەتە سەر خەمی خۆی!

بای شەماڵ ڕۆژێ بە کۆی دولبەری من تێ دەپەڕێ،
هیچ فەرامۆشی نەکەی عەرزی سەلامم هەیە بۆی

پێ ی بڵێ لەو دەمە پاساری دڵم گیراوە
زۆر پەرێشان و بە ئازارە لە دەست چاوی هەڵۆی

دەرفەتە ئێستە ئەگەر مەیلی هەبێ چاری بکا
خۆ ئەگەر لوتفی نی یە بیدەوە دەست خاوەنی خۆی

تووڕە بوو دایەوە دەستم دڵی ئازارو نەخۆش
گوتی : پێویستە هەر ئێستاکە دەبێ لێرە بڕۆی

دڵ گوتی: نایەمەوە لێم گەڕێ واز بێنە بڕۆ
مردن و دەردە سەریم خۆشترە نەک بێمەوە کۆی

کون کون و لەت لەتە جەرگ و دڵی من بەر لە دەمێ
بەتیر ئاوێژی بژانگ و چ بە شمشێری بڕۆی!!

## هەر كاتێ كاتم بێ

لە بۆ قوربانی تۆ ئامادەمە هەر كاتێ كاتم بێ
بە مەرجێ كاتێ هاتی، بم كوژی بەڵگەی خەڵاتم بێ

ئەگەر سەد هێندە ئازارم بدەی زاری لە تۆ ناكەم
لە دووریت بشمرم بڕوا مەكە ڕۆژێ شكاتم بێ

ئەتۆ بڕیاری مەرگم دەربكەی خۆم دێمە پێشوازی
لە دەست ئەم ڕۆژگارە بەدخووە بازو نەجاتم بێ

لە ژێر باری گرانی دەردو خەم دانا چلەكێ شانم
بەسەریا زاڵ دەبم بۆ خۆم دەبێ عەزم و سەباتم بێ

وڵاتم كەعبەیی ئامالمە جێ ی نایەڵم ڕۆژێ
لە جێگای دڵنوازیم سا ئەگەر مەرگم بەراتم بێ

لە دەستی هێرشی موژگانی دەر ناچم بە ئاسانی
ئەگەر بێتو هەزاران كۆنگر و بورج و قەڵاتم بێ

زەوی (دێم)یم ئەوەند كێلاوە كردوومە بە كشتوكاڵ
بەشی ناكا ئەگەر گشت ئاوی سەرچاوەی فوراتم بێ
پەنا بۆ كوێ بەرم ئەی شۆخی دڵ ڕەق ڕێنماییم كە
كە هات ڕۆژێ لە ڕۆژان من لەدەستی تۆ شكاتم بێ

بە شوێنی چارەنووس كەوتووم و ڕاستی ڕێگە بەر نادەم
بە پێ ی زانست و زانین هەردەبێ لەم ڕێگە هاتم بێ!

## مانگی تازە

مانگی تازە دەركەوێ وێنەی هیلالێكی دەوێ
گەر تەمەن دوو حەفتە بوو ئەوسا كەمالێكی دەوێ

ماوەیەك پشت گوێ خرابوو تیغی ژەنگاوی خەیاڵ
بۆ جەلا ئێستاكە سەقڵ و مشت و مالێكی دەوێ

ڕاستە حەق ژێر ناكەوێ پێویست بە تێكۆشان دەكا
ئاشكرایە بانگی ڕاستی خۆ بیلالێكی دەوێ!

گەر کەسێک ویستی کە ڕۆژێ ڕێنمایی بۆ بکەی
کەمترین ماوە لە بۆ ئەم حاڵە ساڵێکی دەوێ

دڵنیا بە هەروەکو یوسف لە ڕێگای چارەنووس
بۆ هەموو سەرکەوتنێک زیندان و چاڵێکی دەوێ

سەیری بورجی کەوکەبەی بەختم بکا ئەستێرە ناس
دوو دڵی بوون بۆ هەموو کارێکی فاڵێکی دەوێ

تا گەیە ئامانج هەتا فوتوا نەدا پیری موغان
سەرپەرشتی مەیکەدەی کەی دیدە کاڵێکی دەوێ!

## خۆشە لە جیهانی خەیاڵ

خۆشە لە جیهانی خەیاڵ
مرۆڤ بفڕی وەک مەل بە باڵ

لەسەر دارێکی زۆر بڵند
لانە هەڵ بەستێ دەستو برد

بیپارێزێ هەموو کاتێ
دەستی زۆرداری نە گاتێ

بەدکار بەرد بگرێتە لانەت
لێت تێک بدات مەرزو خانەت

دەستێکی لێ بوەشێنێ
بێ وەستان خوێنی بڕژێنێ

قۆڵی لێ هەڵکەی مەردانە
بی ڕەتحێنی لەم دەورانە!

کارێکی پێ بکەی تا ماوە
ڕوو نەکاتەوە ئەم ناوە

بیکەی بە پەندی زەمانە!
بەدکار ئەنجامی نەمانە!!

## ڕێ ی چارە ڕەشی

گـــــەلـێـک ڕووی کــــــردە ڕێ ی چـارەڕەشـی
ئـەم کــــــردەوانە دە بـێــــتـــــــە بـەشـی!

گـــێـڵ و هـیـچ نـەزان، دەبـێـــتـــــە ســـەرکـــار
پـوشـت و تـرسنۆک دەبـێـــتـــــە چـەکـــدار

زانـیــــــاری و زانـسـت نـای مــــــینێ بـرەو
زانـــا ســـــــووک دەبــێ لـەلای ئـەم و ئـەو

دارایـی دەچـتــــــە لای پـیــــــاوی لـە چـەر
ڕیـزبـان دەگـــیـــــرێ پـیـــــاوی شـێت و کـەر

دوژمـن دەبـێـــتـــــە کـــارگـــێـــــڕی کـــاری
دۆسـت بێ دەســـتـــەڵات نـای مـــینێ چاری

ڕەوشـــــتـی پـاک و خــــووی جـــوانـمـەردی
لـێ ی بـێــــــــزار دەبـێ درشـت و وردی

کـــــــردەوەی پـووچـەڵ دزی و بـەدکـــــــاری
بـرەو دەســــــتـــــــێـنێ نـرخ و بـازاڕی

بـە ڕاسـت بـێـــــــژ دەڵـێـن وتـاری ڕەقـــــە
درۆ و دەلـەســــــە وتـەی نـەســـتــــەقــــە!

خـــــوایـە کــــــورد دوور بـێ لـەم کــــــردەوانـە
هـەرگــــیــــز نـە چـێـــتـــــە ئـەو ڕێـگـە و بـانـە!!

## باسی کۆیە

دانـیـــــــشـــــە لام خـــۆشـــەویـســـتـم
دەســــتـت بـێـنە بـیــــخـــــە دەســـتـم

داســــــتـــــانـێـکـە نـەک ئـەفـــســــانـە
بـاسـی کـــــۆیـەی خـنـجـــیـــــلانـە!!

وەکـــــــــو دڵـێـن: هـەبـوو نـەبـوو
لـە ڕۆژگـــــــــاری ڕابـورد دوو،

ئێمە منداڵ بووین و لاو بووین
چوستە و چالاک و پاراو بووین

وەرزی بەهار، ڕۆژی هەزار،
سەر چڵ دەگەڕاین وەک هوزار

(ئۆمەر خوچان) باخی (شەمە)
سەیرانگای شاربوون ئەو دەمە

(شاخی مشکە) وەک کێوی (توور)
ئەدرەوشایەوە دوور بە دوور

سەر (قۆنگرە) و (کانی بسکان)
(کەندەکۆخ) و (سەر پلووسکان)

لە (حەمامۆک) تازە یاران
دەبوو بە کۆڕی شایەران

(هەیبەت سوڵتان) تا (پوور تاوس) (١)
جوانتر لە شاری (کەیکاوس)

ناو باخەکانی (تۆبزاوە)
وێنەی بە هەشت بوو ڕازاوە!

خێزان خێزان، دەستە دەستە!
دادەنیشتن وەک گوڵ بەستە

سەماوەری زەردی میر سوار،
قۆریەی سوور پیاڵەی گوڵدار

چێشت و نان و هێلکەی کولاو
ماست وپەنیر، گۆشتی برژاو

ژن لەگەڵ ژن، پیاو لەگەڵ پیاو
هێندی خێزانیش تێکەڵاو!!

پاش خواردن و خواردنەوە،
ئەمجا هەموو کۆبوونەوە!

دەبوو بە بەستەو گۆرانی
هەڵپەرکێ و شایی وشێخانی

دەست لەناو دەست بوو کیژولاو
دڵدار ودولبەر تێکەڵاو،

دیمەنی کیژی ئەوکاتە
دەت گوت فریشتەی ئاواتە

تاسی لەسەر، تاسی زیوین
لا گیرەو دەسرۆکە و پۆشین

گوارەی زێڕی بە لەرزانە
پۆیلەو ملوانکە و گەردانە

باونج لە زیی سوخمەی سووری
دەیبەست لە سینگی بلووری

کەمەرەی زیوو هەیاسە،
هەر کەس دەی بینی و دەتاسا

گۆزینگ بە خاش خاش و خرخاڵ
سەرو سەر پۆش، مل و دەسماڵ

لە پێ سۆل و پانی بەرزی
لەنجەو لارو بالآی بەرزی

کچی کورد بەم وێنە و شێوە،
ئەوسا وا دەچوو بە ڕێوە!

لە بێ گەردی و داوێن پاکی
چوو بوونە باوەش خوای چاکی

دەبوو بە شایی ی ڕەش بەڵەک
تێکەڵ دەبوو حۆرو مەلەک

وێنەی فرشتەو بە هەشت بوو
پۆل پۆل سەیرانکار لە گەشت بوو

(عەزە) کە زورنای دەژەنی
دڵی دڵدار ڕادە چەنی!

دەنگی دە هۆڵ دەبڕایەوە،
شایی تەواو دە کۆژایەوە

دەبوو بە بەزمی سازو نەی
ساقی دەی گێڕا جامی مەی

(بەندی لەشکری) بە شمشاڵ،
بۆی دەگوتین (حەمەی خەیاڵ)

دەنگ خۆشان گۆرانی بێژان
هونەرمەندان و بوێژان،

دەنگی خۆشی خاڵە (سێوە)[2]
سەدای دەداوە لەو کێوە!

کراسی شەنگی (شەنگ مێرەم)ە[3]
مەقامێکە وێنەی کەمە!

(نیوە شەو) (سوارۆ) و (سەحەر)
(ئازیز) و (پایز)، (بووک گەوهەر)[4]

ڕێکو پێک و ساف وردن
ئاوێنەی ڕابوردووی کوردن

دەنگی خۆشی (کاکە مەلا)[5]
بە ئاوازی (شوور) و (سەبا)!

(بەیات) و (دیوان) و (نەوا)
(دەشت) و (ماهوور) و (چوار گا)

ئەمجا بەستەی (شلەو خانان)
دەیان گوت لەسەر گوێ ی بانان

(گۆجە) و (کەچەڵ)، (سێوە) و (مەلا)[6]
هەر چوار بەیەک بەزم و نەوا

(١) ئەم ناوانەی لە ناو جوت کەوانەن ناوی سەیرانگاو شوێنی خۆشی شاری کۆیەن.
(٢) سێوە: مەقامبێژێکی هونەرمەندی کورد بوو (١٨٨٤-١٩٦٤).
(٣) شەنگ مێرەم: مەقامێکی زۆر خۆشی سێوەی هەونەرمەند بوو.
(٤) ئەم ناوانەی ناو جووت کەوانەکان ناوی مەقامی کوردین ولە کۆیە دەکوتران.
(٥) کاکە مەلا: مەبەستی لە مەلا ئەسعەدی گۆرانی بێژە (١٨٩٠-١٩٥٨).
(٦) گۆجەو کەچەڵ و سێوە و مەلا: مەبەستی لە مەحەمەددەمینە گۆجە و قاڵە کەچەڵ و سێوەومەلا ئەسعەدی گۆرانی بێژی ناسروای کۆیە بووە.

کاتی ئێواران ڕۆژ ئاوا،
بووکیان دەهێنا بۆزاوا

(ئەحمەد) بە (ئای شیرین بەهار)
خۆشتر لە ئاوازی هوزار

لە ئێوارە تا نیوەی شەو
خۆشتر لە بەزمی کەی خوسرەو

بەزم وئاهەنگ و شادی بوو
دوور لە خەم و بێ دادی بوو

نەک وەک دۆست و ئاشنا بووین
هەمووی لەگەڵ یەک برا بووین

نە سینەما و سینەما بوو،
ئەوسا هەڵپەڕکێ و سەما بوو!

## لە شین دام

یاران لە شین دام یاران لە شین دام
نیوە سەر بڕاو، لە خاک و خوێن دام

ئەو تیرەی غەمزەی لە ئەبرۆی کەوان
نیشانت لێ گرت وەک نێچیرەوان

هیچ سەری نەکرد پێکای نیشانە،
لانەی یادی تۆی کردم وێرانە

ئێستا دڵەکەم بێ لانەو مەرزە
ئاوارەو گەڕۆک وەک لاوی هەرزە

هیچ ئارام نابێ دڵەی ئازووردە(۱)
زۆر خەمبار ترە لە ئازیز مردە!

هەر بە یادی تۆژیانی ما بوو
ئەستێرەی هیوای دیسان ئاوا بوو

هەر کارێ بکرێت بێ تاقیکاری
چاوەڕێ دەکرێ ئێش و ئازاری

ئەمە ئەنجامی هەموو نەزانە
کە خۆی بسپێرێ بە دەست بێگانە!!

کە بەرژەوەندی خۆی هاتە کایە
فوتوای مەرگی تۆی لەلا ڕەوایە

لە مردنی تۆ زۆر زۆر بێ باکە
وەر بگرە نەزان ئەمەت بۆ چاکە!

(١) ئازووردە: دڵ شکاو

## ڕەنج دەکێشم (*)

ئەی کەمان ژەن لێ دە ئاوازی (نەوا)
بێژە (ڕاست) تا دێیتە سەر (شۆر) و (سەبا)

ئەو دەمە ئارام بوەستە تا بەیان
دەم لەسەر دەم دەست دەچێتە سەر (بەیان)

شەو کە ڕادەبڕێ کش و ئارام و مات
کێ دەزانێ تا بەیان چی ڕوو دەدات؟

من کەبێ ئارامم و دڵ پڕ لە دەرد
دژ بە من وەستاوە چەرخی لا جوەرد!

شەڕ فرۆش و زویرە لێم دڵ پڕ لە قین
بەد ڕەوشتی گەیوەتە حەددی یەقین

سەر نزم ناکەم ئەگەر سەر هەڵبڕم
بێ گومان سەد بەرد دەهاوێ بۆ سەرم

ئاشنا نابین لەگەڵ یەک چونکە من
نابمە هەم سایەی ئەوانەی بێ خەمن

ڕەنج دەکێشم، تێ دەکۆشم، ڕۆژ و شەو
تا بەدەست دێنم هەموو مەرجی گرەو!!

ئەو دەمە زۆر سەر فراز و بەختیار
دەچمە ڕیزی چینی داماو و هەژار!

خۆ بە زۆر دانان و بایی بوون بە خۆ
ئافەتێکە مەرد دەکا سووک و خەڕۆ!

چەند بە نرخی گەر بزانی نرخی خۆت
چەشنی موو دەپسێ لە پێت زنجیر وکۆت

ڕاست بڕۆی گیرو گرفت چەند بێتە ڕێت
دڵنیا بە چقڵێ هەڵناچێ لە پێت

ئەی کەمان ژەن بیرکەوە وا هات بەیان
شەو بەسەر چوو چیت نەکرد بۆمان بەیان

پێ ی گوتم: (عەونی) وەرە ئێستا بڕۆ
زۆر نەماوە دێیتەوە سەر گفتوگۆ!!

(*) ئەم هۆنراوەیە لە گۆڤاری (کاروان)ی ژمارە ٦٦ی تەمموزی
ساڵی ١٩٨٦ دا بلاّو کراوەتەوە.

## گەشتی مانگە شەو

١٩٨٦/١٢/٣٠

هاوین شەوێکی مانگە شەو،
دانیشتم چاوم نە چووە خەو!

کەوتمە بیری دوور ئەندێشی،
کە سەرنجم ڕا دەکێشی!!

بەرەو جیهانێکی بەرین،
کە ئێمە لێ ی بێ خەبەرین،

ئاسمانێکی بێ سنووره
ڕێگەی زۆر بە ترس و دووره!!

هەستام چووم ڕووم کردە چۆڵێک
کەوتمە داوێن هەردو دۆڵێک

منی ئاوارە و سەرگەردان،
بە بیرم دا نەهات ترسان

زۆر گەڕام لەو چۆڵ و دەشتە
ئەو دەشتەی وێنەی بە هەشتە!!

کەوتمە داوین کۆهسارێک
ڕێم دەر نەکرد لە کنارێک

تا ماندوو بووم لە پێ کەوتم
هەورازێک بوو، سەر نە کەوتم!!

لەو کاتەدا مانگ ئاوابوو
ڕێگای دوورم لێ کۆتا بوو

دەبێ چاو لە ڕێ ی کاروان بم
گوێ گری بانگی بەیان بم

## هونەری جوان

هەڵبەست و وێژە، مۆسیقا و وێنە
هونەری جوانن، هەر سێ بێ وێنە

وێنە ئایاتی سیحر وبەیانە
مۆسیقا، ئاواز خۆراکی گیانە

هەمووی بەرهەمی پەنجەی هونەرن
نرخیان وەکو ڕشتەی گەوهەرن

هەر گەلێک هونەر بوو بەسامانی
رێزی بۆ دانێ نرخی بزانی

ئەو نەتەوەیە ناوی لە ناوا
هەر نەمر دەبێ ولاتی ئاوا!!

وەرزش ، هەڵپەرکێ، سەما هونەرن
بیکەن زۆر گەڵکیان لێ وەر دەگرن!!

## جیهان

پرسیان لە جیهان بۆچی شووت نەکرد هەروا مایەوە،
سەری هەڵبڕی ناسک لەسەر خۆ جوابی دایەوە!

ئەو کەسەی ویستم من شووی پێ بکەم کە خۆشم دەویست
زۆر کۆششم کرد لە بەختی رەشم ئەو منی نەویست

هێندێک لە وانەی خۆشیان دەویستم هاتنە داخوازی
شووم پێ نەکردن بە هیچ کام لەوان من نەبووم رازی

جا لەو ساوە هەم وەکو دەم بینی هەروا مامەوە
دڵنیات دەکەم هیچ کەس ناتوانێ بێ بەلامەوە!

سوپاس و رێزم بۆ ئەو کەسانە دەژین مەردانە
سەر نزم ناکەن، خۆ نا فرۆشن، بە پوول و ئانە!

## نازێ

راوەستا بووم لە رێ بازێ
کیژێکم بینی ناو (نازێ)

کیژێک شۆخ و شەنگ و ناسک
جوانتر و سڵتر لە ئاسک

وا دیار بوو هێندێک گریا بوو
فرمێسکی لە چاوا وەستا بوو

پێم گوت: ئەی کیژ تو جوانیت
تۆ خۆشەویستەکەی گیا نیت

بۆ وا پەرۆش و داماوی؟
گیرۆدەی عەشقی کام لاوی؟

کە ئەمەی بیست کیژۆڵەی ژیر
گوتی: مامە، ئەی مامەی پیر

سوێند بە یەزدانی بێ هاوتا
دڵم لا ی خۆمە تا ئێستا!

من کە گیرۆدەی ئەڤین نیم
لە بیرو یادی کەس دا نیم!

برام شەهید بووە، ڕۆژ و شەو
بێ ئارامم بێ خواردن وخەو

لەو بیرە دام چەک هەڵگرم
تۆڵەی خوێنی ئەو وەرگرم

پێکەنین ناچتە سەر لێوم
شاد نابێ دڵەی پەشێوم!

حەز دەکەم منیش وەک کاکم
بە خوێنی خۆم سوور کەم خاکم

بەرگری بکەم لە نیشتمان،
نە کەوێتە دەست دوژمنان!!

- ئافەرین بۆ هەستی پاکت!
خوشکی دڵسۆزی بۆ کاکت

ڕۆڵەی وەک تۆی بێ نیشتمان
قوڕ بەسەری داگیرکەران!!

دەبێ لێی دەرچن بێ وەستان
خاوەنی هەیە کوردستان!

ڕۆڵەی ئازا و جوامێرن،
لە هەڵمەت بردن وەک شێرن

دوور نی یە ئەو ڕۆژە بەیەک دەنگ
بشکێنن تۆقی عارو نەنگ!

حاجی دەڵێ: گەر یەک بگرن
دەورو پشتی خۆیان دەگرن

واز بێنن لە ناتە بایی
بێ گومان دەکەن بە شایی

دەست لە دەستی یەک خەن، هەستن
یەک دەنگ بن، پشت بە خوا بەستن!

## ئەی لاوی ژیر

گوێ بگرە ئەی لاوی ژیر
پەند و ئامۆژگاری پیر!

وەک زێڕ بیخە گیرفانت
بۆ ڕۆژی لێ قەومانت

ڕووداوی سات و کاتە،
دەسبتکەوتی بەسەر هاتە!

لە ڕۆژانی پێویستی،
بۆ ژین و تەندروستی

لە پێناو خۆشی و شادی
پۆ سەربەرزی و ئازادی

ڕۆژان ڕۆژی لە دوایە
بۆت دەبێتە سەرمایە!!

چرای شەوی تاریکە،
ڕابەری ڕێ ی باریکە!

لە بیرت بێ هەمیشە،
بۆ خۆت بیکە بە پیشە!

هاوڕێ ی نەزان بێ سوودە
ڕەنجت دەڕوا بێ هوودە

ڕێگەی پێش خۆت ببینە،
ئەمجا هەنگاو هەڵێنە!!

مەبە مەلی بەرزە فڕ
دەکەویە خوار کتو پڕ!

ئەمەت بیستوە لە مێژە
«زۆر ببیە کەم ببێژە!!»

کارێکت گەر نەزانی
لێ ی مەدوێ بە نەزانی

لە ئەم لە ئەو بپرسە
زوو فێر دەبی مەترسە

فەرموویانە لەمەو پێش
«خێر بە خوێش نەک بە دەروێش»

لە ڕەنجی دەست و شانت
بخۆ لە نان و خوانت

چاو چنۆکی و بەخیلی
دەتخاتە چاڵی دیلی

چاکە بکە چەند دەتوانی،
نا بینی پەشیمانی!

تۆ بۆ خۆت چیت پێ خۆشە
کردەوەت وابێ خۆشە!

دەست و داوێنت پاک بێ
کردوەت بەرزو چاک بێ

لە درۆ خۆت بپارێزە،
درۆزن سووک و بێ ڕێزە!

لەگەڵ ڕاستی ئاشنابە
لە کۆمەڵ جێی بڕوابە!

هەر کەس کاری کەوتە لات
بە پێی هێزو دەسەڵات

بە جێ بێنە پێویستی
لە لای خوا خۆشەویستی

کێ خاوەن هەستی پاکە،
خۆی هۆگر کا بۆ چاکە!

هەموو ئامۆژگاریی پیر،
بۆ تۆیە ئەی لاوی ژیر

با گەلت سەر فراز بێ
جێگای هیواو نیاز بێ!!

## با ڕزگاربین

با بۆی دەرچین، با ڕزگاربین
بۆچی لە ژیان بێزار بین

ژینی وا پڕ تاڵی و تاسە
دوور لە شادی یەک هەناسە

ئێمەش مرۆڤین دەزانین
پێویستی خۆشی ژیانین

تاکەی وەها چارە ڕەش بین
لە شادی و خۆشی بێ بەش بین

وا چاکە دەستی یەک بگرین
ڕێگای زۆر دوور و سەخت ببڕین

بڕۆین بڕۆین تا دەتوانین
بەرەو ئاسۆی گەش بڕوانین

ڕێگە زۆر پڕ ترس و لەرزە
چیای هیوا لوتکەی بەرزە!!

بەڵام لەوێ کە سەرکەوتین
خاوەنی ماف ودەسکەوتین
دەچین بۆ جیهانی تازە
جێ ی هیواو خواست و نیازە

ئەوەی لەوێ بەهرەوەر بێ
دەشێ لە ژین بەختەوەر بێ

دوور لە بەدکاری و ئاژاوە
هەموو مافێک پارێز راوە!

لەوێ تێکۆشان و خەبات
دەتبا لە بۆ ڕێگای نەجات

نە شەڕو شۆڕ، نە خوێن ڕێژی
نە تاونکاری و بەد بێژی

نە خوێن مژین، نە زۆر داری
نە بێ کاری، نە هەژاری

هەر کەس بۆخۆی تێ دەکۆشێ
دەخوا، دەخەوێ، دەنۆشێ!!

# وەیشوومەی خەزان

وەیشـــوومـــەی خـــەزان، بـاخی شـــێـــواندم
گـــــەڵای درەخـــــتی هیـــــوای وەرانـدم!
بـە هـاری ســـەوزو ســـووری زەرد کـــردم
خــــونچـــــەی نا کـــــامی بـە تـاڵان بردم

ســــــرووەی بـەیـانم بـووە گـــــەردە لـوول
ئـادارم گـــــۆڕا ، دیـســـــــان بـە ئـەیلـوول

کــــردی بە شــــێــــوەن بـولبــــول لە چڵــــدا
چـقــــــــڵـی ئـازاری گــــــــوڵـی لـە دڵـدا!

بــاخـــــــەوان کـــــــــردی بـە شین و زاری
قــــــینـی خـــــــەزانـی لـە ڕووی دەبـاری

تـف لـە ڕەوشــــــــــتی چەرخـی بـەد کــــــــردار
خــــۆی کـــرد بە کـــوتەک بۆ دەســـــتی زۆردار

خــــــــەزانـیـش دەڕوا بـەهـار دێـتـــــــــەوە
«گــــیــــا لـەســـەر پـنجی خــــۆی دەڕوێتـــــەوە»

# خونچە گوڵێک

خونچە گوڵێک، لەسەر چڵێک
گوێ ی گرت بوو، لە بولبولێک

بولبول بە دڵێکی پڕ لە جۆش
جیهانی کردبوو فەرامۆش

وەستا بوو بەرامبەر بە گوڵ
فرمێسکی دەڕژاند زۆر بە کوڵ

دەی خوێند هەردەم بە ئاوازێک
بۆی ئاشکرا دەکرد ڕازێک!!

خونچەی دڵ تەنگ بێ بەزەیی
لە نهێنی بولبول گەیی

پەردەی لە ڕووی لا کردەوە،
لەسەر خۆ لێوی کردەوە!

گوتی: بولبول هەر زەکاری
لێت بۆتە خوو شین و زاری

هەردەم لەسەر لقی چڵی
هەر ڕۆژ بەرامبەر بە گوڵی

فرمێسکی خوێنین دەڕێژی
گۆرانی خۆش خۆش دەبێژی

هەر بۆ ئەوەی بەدکەی نێوم
لێوت بخەیتە سەر لێوم

زۆر خۆت دەکەی ماندوو وشەقی
چقڵێک لە ژێر پێت دەچەقی

من تا ئێستا پارێزراوم،
چقڵی خۆمە دەوری داوم!

نە تۆ نە باخەوانی پیر
نا توانن بم کەن دەست گیر!!

خونچەی باخی کوردەواریم
بەراتی مژدەی ڕزگاریم!!

# خانمی مەی گێڕ

١٩٨١-١٩٨٢

خانمی مەی گێڕ وەرە بۆم تێکەوە
ڕێگە دوور و زۆر بە ترسە ڕێم کەوە

پەستم و کەو توومەتە ناو چاڵی غەم
بگرە دەستم زویر مەبە لێم تاکو هەم

زۆر پەرێشانم بە دەست ئەم چەرخەوە
بەختی بەد ڕەفتار بەسە وەر چەرخەوە

تۆ کە دەم بینی بە بێ هێزو زەبوون
سیس و ژاکاو کەوتمە نا گۆمی خوون

وا بەزامی خۆمەوە دەتلێمەوە،
بێ کەس و ئاوارەمە دەخولێمەوە

گوم بووە لێم ڕێگەیی ڕاستی نەجات
کێ دەزانێ چارەنووس بۆکێم دەبات

ئاشنایێک بێتە ڕێ نیشاندەرم
پێم بلێ ڕاستی پەنا بۆ کوێ بەرم؟

چاکە خۆم ئامادە کەم بۆ بەرگری
دوژمنم لاسارە دەست هەڵناگری

ڕیزی خۆم ڕێک خەم بە زانست و بە هۆش
هێزی خۆم یەک خەم وەکو هەنگ بێمە جۆش

تا بەیەک هێرش لە مەیدانی نەبەرد
دوژمنم پەرت کەم ببێتە تۆزو گەرد

خانمی مەی گێڕ بە جامێ ڕووکە من
تا نە شێواوم و وزەم پێ ماوە من

هەر کەسێک بەردێک بهاوێژێتە من
پێ ی دەبەستم دەستی زوو دەبڕم لەبن

دەی کەمە پەند تا ببێن دوژمنان
من کە کوورەی ئاگرێکم بێ ئەمان

دێمە مەیدانی شەڕی مان ونەمان
تا بە جارێک تارو مارکەم دوژمنان

چۆن ببینم نیشتمانی بەش بەشم
بویتە مۆڵگەی دوژمن و من بێ بەشم

دەبمە نا پاڵم وەیان بۆمبای ئەتۆم
تا بسووتێنم ئەوانەی دژ بە خۆم

ئەو دەمە دەرمان دەبن زام وبرین
سەر لە نو دەست پێ دەکا دووبارە ژین

خاک و مەرزم لەو پەڕی تا ئەو پەڕی
نا یەڵم دوژمن بە ناویا تێ پەڕی

دەستی دەبڕم قاچی دەشکێنم بە بەرد
چۆن دەبێ لێم بۆ گەکا پاوانی هەرد

سەر لەنوێ بۆی دێمەوە کۆڕی خەبات
سەد بەڵێن بێ کۆڵ نەدەربم تا مەمات

گشت برینی کۆن و تازەم هاتە سوو
بۆ پزیشکێ بێ بکا دەرمانی زوو

خانمی مەی گێڕ بە جامێ ڕووکە من
تا نەشێواوم، وزەم پێ ماوە من

گەرچی پێویستم هەیە بۆ سانەوە
خۆشترە بمرم بە دەردو ژانەوە

خۆشترە بمرم لە کۆڕی جەنگەوە،
نەک ژیانێک پڕ لە عارو نەنگەوە

گیان بەخت کردن لە ڕێگای نیشتمان
بۆ هەمیشە زۆر پیرۆزە کۆڵ نەدان

دوژمنت گەر هەست بکا هێزت هەیە
ئەو حسابت بۆ دەکا ڕێزت هەیە

دێمە مەیدان بۆ فیداکاری و نەبەرد
تا لە دوژمن تەنگ بکەم ڕێ ی دەشت و هەرد

شاری میرووی لێ ببێتە قەیسەری
ناهێڵم گیانی بە هیچ لا دەر پەڕی

گەر ئەمن زوو نەی کوژم ئەو دەم کوژی
خوا موعین بێ نایەڵم چیتر بژی

ئەو کەسەی من بۆ ی دەگریەم ڕۆژ و شەو
وا حەرامم کرد لە خۆم خۆراک و خەو!!

ئەو چەکی هەڵگرتووە دێت دەم کوژی
پێم دەڵێ تۆ زۆر بڵێ ی نابێ بژی!

ئەی برای کورد بەسیە تاکەی بیر کەوە
خۆت لە زەڵکاوی نەزانی دەرکەوە!!

«خانمی مەی گێڕ بەجامێ پڕ لەمەی
ئارەزوومەندم فەرامۆشم نەکەی!!»

هەر ئەوەی گیانی لە ڕێگا بەخت دەکەی
ڕێ ی بە ترس و لەرزی وا بۆ تەخت دەکەی

ئەو هەڵی بۆ هەڵکەوێ دەتکا بە قووت
کاتێ زانیت کەوتیە ناو زاری حووت!!

سوود نابەخشێ پەشیمان بوونەوە
ماوە نامێنێ لە بۆ دەرچوونەوە!!

من بە پێویستی دەزانم ڕۆژ و شەو
هەر بە چاکە ڕێنماییت بۆ بکەم

بەرگری کردن لە کاری بەد ڕەوشت
ئەرکی سەر شانە لەسەر وردو درشت

تا لە خاک ومەرزی خۆم نەی نێمە دەر
دەستی لێ هەڵناگرم خاکی بەسەر

دەیکەمە پەند بۆ هەموو دەس درێژەکان
چی دیکە ژێر پێ ی نەخەن مافی گەلان

ڕێ ی نەجات دەگرم لە دوژمن ڕا نەکا
تا قیامەت فیتنەیەک بەر پا نەکا

بۆ ڕەزامەندی خوداو پێغەمبەران،
زۆر پیرۆزە بەرگری دەست درێژکەران!

بەم گوتە بڕوا مەکە حەق ژێر کەوێ
هەر درۆیە! نابێ نا حەق سەرکەوێ

«خانمی مەی گێڕ وەرە واهات بەیان
تێکە جامێک لا بەرێ گشت دەردو ژان!»

نا گەیە ئامانج بە دانیشتن برا،
«لیس للانسان الا ما سعی»

بەرهەمی ڕەنج و فیداکاری و خەبات
سەر بڵندی و بەختیاریت دەست دەخات

من لە لایەن خۆم لەگەڵ داگیرکەران
دژ دەوەستم تاکو ماوم بێ وچان

کورد لە کوردستان بمێنێ یەک نەفەر
نابێ داگیرکەر بکا گەشت و گوزەر

کورد هەیە! کورد خوا موعین بێ هەر دەژی
نایەڵێ قەت خەونی دوژمن بێتە دی

جارەها دوژمن کە سەریان دا لە بەرد
هاتنە کوردستان و بوونە تۆزو گەرد!

هەروەکو جارانی پێشوو و زێدە تر،
نەوت وپووشە دوژمنم خۆم دەبمە گڕ

ئاگری تێ بەر دەدەم نە کوژێتەوە،
وا بسووتێ تا ئەبەد نەکوژێتەوە

بۆ قەل و داڵ چۆن دەبێ لانەی هەڵۆ
چۆن بکا ڕێوی لە جێ ی شێر هات و چۆ؟

خانمی مەی گێڕ لە دوژمن دڵ پڕم،
تاکو ماوم دەستی لێ هەڵناگرم!

تێکە بۆ من لەو مەیەی دوو بارەیە
تا بجەنگم شەرتی هەر ئەم جارەیە

چۆڵ بکەم مەیدان و دوژمن سەرکەوێ
زۆر بە زەحمەت جارێکی تر دەرکەوێ

وەک هەڵۆ چەنگی لە خاکم گیر بکا
زۆر بە ئاسانی منیش دەستگیر بکا

هەر کەوا بێ ئەرکی سەر شانی تووە
گیان فیداکەی ئەی برا هەر چەند زووە

تار ومار کەین دوژمنان پەرت وبڵاو
با زەوی دێم کەین لە خوێنی وان بەراو

بەرگری کردن لە کاری بەد ڕەوشت
ئەرکی سەر شانە لە بۆ وردو درشت

زۆری وا هەن ئێستێکە هەرگیز نەبوون
هاتنە نێو مەیدانی زانست و فنوون

ئێستە ئەندامن لە ڕیزی دەوڵەتان،
خاوەنی هێزو سوپا و فەرمانڕەوان!!

نێو چاوانی من بە تەنیا مۆر کرا
شەقڵی ژێر دەستیم لە چوار لا لێدرا

ئاشنایێکم نی یە لەم عالەمە
چونکە خۆم بڕوام بە بوونی خۆم کەمە

ڕوو لە هەر ڕێگا دەکەم بەستراوە لێم
سەر بە هەر کوێ دادەکەم نا پرسی کێم؟

«خانمی مەی گێڕ خەم و دەردو کەسەر
دەوریان داوم بە زەحمەت بچمە دەر»

گورگی بەد ڕەفتارە دوژمن برسی یە،
مەڕ شوانی گەر نەبوو ترسی نی یە!

خۆی دەزانێ بوونی من بۆ مافی ئەو
ترسناکە ڕۆژی گەر هەستم لە خەو

بۆ قەل و داڵ چۆن دەبێ لانەی هەڵۆ
چۆن بکا ڕێوی لە جێ ی شێر هاتو چۆ؟

تێگەیشتم ئێستە هوشیارم ئەمن
وای بە چی دەردێک گرفتارم ئەمن

دژ بە یەکتر بوونمان چۆن فێر ئەکەن
یەک نە ناسین بۆیە چاومان کوێر دەکەن

زۆر لە مێژە موبتەلام بەم دەردەوە
وەک لە خەو هەستام و چاوم کردەوە

تێگەیشتم من هەڵەم زۆر کردووە!
بۆچی بۆپارە برای خۆم کوشتووە؟

یەک لە وانەی وا پەشیمان بوونەوە
ئێستە بۆ ڕیزی شەرەف هاتوونەوە

گوێ گرە چیت بۆ دەبێژی ئەی برا
دەستی یەک بگرین هەموومان وەک برا

ئەو برایەی هەر لە ڕێ ی سەربەستی من
خۆی بەخت کرد چۆن نە بزوێ هەستی من ؟

خانمی مەی گێڕ خەم و دەردو کەسەر
دەوریان داوم بە زەحمەت بچمە دەر

زوو بە زوو جامێ لە مەی ڕەنگ ئەرخەوان
با بنۆشم هەست دەکەم ئێستا ژیان

شەرمەزارم ڕووم نی یە سەر هەڵبڕم
ئێستە خۆم ناسی لە دوژمن دڵ پڕم

گەر فیداکاری نەکەم بۆ نیشتمان
لێم حەرام بێ ئەی برای کوردم ژیان!!

# بۆ چلەی خوا لێخۆشبوو
# هونەرمەند تایەر تۆفیق

١٩٨٧/١١/٢٠

ئەمـــڕۆ ڕۆژێـکە کــەوا تێــپــــەڕ دەبێ ڕۆژی چلەی
چونکە هەر لەم ڕۆژەدا وەســتـــا لە لێــدان ئەو دڵەی
ئەو دڵە پڕ ســـۆز و پڕ جــۆش و چریکەی بولبـولەی
نیشتمان بوو خواستی ئەو خستبوویە شوێنی ئەو گوڵەی
نـامــرێ دەنگی دەمــێنێ تایەری خــۆش خــوانی من

ژین و مــەرگ حــاجی دەڵێت وێنەی هەتاوو ســایەیە
ئەو کـەسەی خووی چاکی کـردە پیشە بۆی سـەرمایەیە
خــۆشــەویســـتی کــۆمــەڵە هەردەم لە بەرزی پایەیە
کـــردەوەی چاکی پەسندە جێ ی ڕەزای ئەو خـــوایەیە
نـامــرێ دەنگی دەمــێنێ تایەری خــۆش خــوانی من

ئەو کـــەســـە زانایە گـــەر ڕۆژانی ژین بایی نەبێ
تووشی بێ ڕێزی و هەڵە و شــێــوان و ســەودایی نەبێ
گــەر لەمــاوەی ژینیــا چەند پێش کــەوێ بایی نەبێ
زۆر دەبێ ئاگــای لە خــۆی بێ تووشی ڕیســوایی نەبێ
نـامــرێ دەنگی دەمــێنێ تایەری خــۆش خــوانی من

زۆر هەژاری چەشت لە ژین دا مــاوەیێکیش ڕای بوارد
مل کـەچی بۆ کـەس نەکرد تا ڕۆژێ هات گـیـانی سپارد
یارمـەتی داوا نەکـرد و خــواســتی بۆلای کـەس نەنارد
خــۆی لەبۆ خــۆی هان دەدا بۆ پیــاوەتی خــۆی هەڵبــژارد
نـامــرێ دەنگی دەمــێنێ تایەری خــۆش خــوانی من

کــۆڕی شــینی بۆ دەگــێــڕێت هەر کــەسێ کــۆڵی نەدا
هەر کـەسێکی تاکو مردن قەت لە ڕێ ی ڕاست لای نەدا
هەر کــەســێک وابوو لە مــاوەی ژینیــا خــۆی بانەدا
ئافــەرین بۆ ئەو کــەســە بۆ دەست بڕین خــۆی هەڵ نەدا
نـامــرێ دەنگی دەمــێنێ تایەری خــۆش خــوانی من

ســەد درووودو ســەد ســەڵاوم بێ لە گــیــانی پاکی تۆ
دەستەیێ گوڵ پێشکەشی سەر گۆڕەکە و سەر خاکی تۆ
ئافــەرین ســەد ئافــەرین بۆ هەست و نەستی چاکی تۆ
خوایە ڕەحمــەت ڕێژی کا ســەرگــۆڕی باوک و دایکی تۆ
نـامــرێ دەنگی دەمــێنێ تایەری خــۆش خــوانی من

## مێژوو

ئەگەر ڕاستیت دەوێ مێژوو درۆیە
هەموو ڕووداو و ڕابردوو درۆیە!

بە چاوی خۆت دەبینی کارەساتێک
دەگۆڕێ پێچەوانەی هەر لە کاتێک

ئەوەی مێژوو دەنووسێ وەک بە ڕۆژە
گوڵێکە تابیعی سوورانی ڕۆژە!!

## شیعری وەسف

## ئەی گوڵ

ئەی گوڵ لەسەر چڵانت
بوین بەپاسەوانت،
لە ترسی بولبولانت
بۆ تۆ ئەی گوڵ، گوڵی سوورم
لە تۆدوورم من مەلوول

ئێستا لە تافی جوانی
قیبلە گای دڵدارانی
منیش دەڵێم گۆرانی
بۆ تۆ ئەی گوڵ، گوڵی سوورم
لە تۆ دوورم من مەلوول

نا مەوێ ژینی پەستی
دەکەومە بیرو هەستی
دەینم مژدەی سەربەستی
بۆتۆ ئەی گوڵ گوڵی سوورم
لەتۆ دوورم من مەلوول

شەوو ڕۆژ بیرو خەیاڵم،
دڵداری لێوی ئاڵم،
گوێ بگرە ناڵە ناڵم!
بۆ تۆ ئەی گوڵ گوڵی سوورم
لە تۆ دوورم من مەلوول

بەهیوای بەختیاری
چووم لە پێناو دڵداری
گوێ بگرە شین و زاری
بۆ تۆ ئەی گوڵ،گوڵی سوورم

لە تۆ دوورم من مەلول

## وەک هوزارێک

وەک هوزارێک لە گوڵزارێک
لانەم هەڵبەست لەسەر دارێک

بەرامبەر بە گوڵ هەمیشە
ناڵینم کرد بووە پیشە

لە ئێوارە تا بەیانی
من کرد بووم پاسەوانی

چریکە و ئاوازی خۆشم
ناڵەی دڵی پڕ لە جۆشم
چیمەن پڕ بوو بوو لە شادی
نەم بوو هیچ ترسی بێ دادی

هیوام ژیانی بێ ژان بوو
ستەم کاریم لاگران بوو

هەموو ئاوات و مەبەستم
لەگەڵ خونچەی خۆشەویستم

کوڕێ ببەستین دوو بە دوو
پێ ی بڵێم تاکەی من و توو؟

داخ لە دڵ و ڕەنجەڕۆ بین
جێگای ڕەخنە و پەند وپۆ بین

خونچە گریا یەخەی دڕاند
دڵۆپێک فرمێسکی ڕژاند

گوتی: من جوانی ی ڕوخسارم
بویتە هۆی دەردو ئازارم

دڵنیا نیم لە هیچ کاتێ
دەستی باخەوان نەم گاتێ

بێ بە زەیی بێت بم چنێ
ڕیشەی ژینم هەڵ بکەنێ

بم با لە بازاڕ بە هەرزان
بم فرۆشی بە ناکەسان!!

دەم ژاکێن هەڵ دەوەرم
لە ژێر پێیان دا دەمرم!!

## بولبول(١)

وەرە ئەی بولبوولەکەی خۆش خوانم،
هۆگری خونچە گوڵی باخانم!!

باخەوان دەنگی نی یە نیوە شەوە
دەرفەتە تاکو بەیانی مەخەوە!

بەر لەوەی خونچە کەوا پێ بکەنێ
باخەان هەستێ لە خەو گوڵ بچنێ!

چڵ بە چڵ شوێن گوڵی هیوا بکەوە
بۆی خەریک بە پەلەکە دوا مەکەوە

هیچ گومانم نی یە هەر دەست دەکەوێ
گوڵ نەدانی گەرەکە ڕەنجی دەوێ

هەر گەلێ درێژە بدات گەر بە خەبات
بانگی ئازادی لە بۆ دێت بە خەڵات

ئەم بەراتەی کە بە خوێن دەست دەکەوێ
نرخی بۆدابنێ ژێر پێ نەکەوێ

بەرهەمی ڕەنجە برا بەختەوەری
داری ئازادی بە خوێن بەر دەگری!

وەرە ئەی بولبوولەکەی دەنگ خۆشم
مژدە بێ لێت کە منیش دڵ خۆشم

من و تۆ و گوڵەکە یەک دەگرین
لێک جیا نابینەوە تا دەمرین

تۆ بخوێنە لە لق و پۆپی چڵان،
دەنگی ئازادی بگەیەنە بە گوڵان!

هێرشی هێزی شکا شۆڕی خەزان
چاوەڕێ بن هەڵی کا بادی خەزان

گوڵ بە ڕوو سووری بە ناز پێ بکەنێ
بەرگی بێ شەرمی لەبەر دا بکەنێ

دۆستی ئێوەش کە بەڵێن دا پێتان
هەموو ڕوو داوێ بنووسێ بۆتان!

(١) ئەم هۆنراوەیە لە گۆڤاری (کاروان)ی ژمارە ٢١ی مانگی حوزەیرانی ساڵی ١٩٨٤ دا بڵاو کراوەتەوە.

# کەو

ئەی کەوی ڕەوت جوان
ئەی دەنگ خۆشی ناو مەلان

دەنووک سوور گەردن نەخشاو
نە کەوی یە ناو بەندو داو!

لەم سەر بەرد بۆ ئەو سەر بەرد
هەڵدەفڕی بێ ئەرک و دەرد!

لە نسێ و لە نزاران،
لە هەردەو کۆهساران!

لە دەشت وکێو و گەلی
ئەتو جوانترین مەلی

هۆگری دەنگی خۆشم،
پەندێکت پێ دەفرۆشم!

واز بێنە لە دانەو داو،
ڕاو کەرێک دەتکا بە ڕاو!

کە ڕووداوی ڕۆژگار
بۆ کەس نایەتە ژمار

هەر چەند بۆخۆشت کەوی
شوێن دەنگی کەو نەکەوی

بۆت دەخوێنێ بە گەرمی
بانگت دەکا بە نەرمی!

بۆ ئەوەی بتخاتە داو،
باڵ شکاوو سەر بڕاو!

# نەورۆزی ساڵی تازە

نەورۆزی ساڵی تازە جەژنی بەهارە ئیمڕۆ
دەنگی بلوێر لە دێ یە یان نەی لە شارە ئیمڕۆ
خونچە لە باخی شادی لێوی بە پێکەنینە،
بۆیە لەسەر چڵانی شینی هوزارە ئیمڕۆ

مەی گێڕ بە چاوی مەستی لە کۆڕی بەزمی یاران
موفتی سەما دەکێشێ واعیز خومارە ئیمڕۆ

زولفی لە ڕووی کە شێواند، کزەی وەزانی شە و بۆ
میسکی خوتەن بە تا تا، عەنبەر بە بارە ئیمڕۆ

لەم دەشت و مێر غوزارە، لەو باخ و جۆیە بارە
قومری بە شین و زاری، شایی چنارە ئیمڕۆ

پۆل پۆلی کیژ و لاوە، لەو دەشتە تێکەڵاوە
هەر زەرد و سەوز وئاڵە بو سەو کەنارە ئیمڕۆ

دڵدار ویاری دولبەر، ڕاز و نیاز و ئاوات
هەر یێکەدوو لە سێ یە، هەر سێ لە چوارە ئیمڕۆ

ئاسکی ئەم هەرێمە، ماڵی یە دەستە مۆیە
شەهێنی ڕاوە یاخۆ بازی شکارە ئیمڕۆ!

(عەونی) بە یادی جاران، لە کۆڕی بەزمی یاران
لە ڕیزی مەی گوساران، تەنیا دیارە ئیمڕۆ!!

# وەرزی بەهار

ئارایشی خۆی داوە چەمەن وەرزی بەهارە
بووکی گوڵە ئامادەیە، دامادی(١) هوزارە

بنوارە کە وێنەی هونەری دەستی سروشتە
ئەم دەشت و کەژە گوڵ گوڵ و ڕەنگین و نیگارە

بەیبوون و بنەوشە بە جیا سونبول و سووسن
وەک پەرچەمی یارە بەرەزا وا لە نەزارە

شەونم مەیە، نێرگز قەدەحە، لالە سوراحی
دارو دەوەن و دەشت و چیا مەست و خومارە

گۆرانی یە، ئاهەنگە، چ بەزمێکە لە گوڵزار
قومری، بە نەواو(٢) ناڵەیە چۆپی لە چنارە

ئاهیستە(٣) نەسیم دێت و دەبزوێنێ گەڵای دار
شا باشی دەکا گەوهەرو مرواری بە بارە

لوء لوء دەڕژێنێ لە دەر و پشتی بنەوشە،
بەخشندەیە گوڵ یەعنی کە دڵسۆزی هەژارە!

مەی گێڕ چ دەبێ ئیمشۆ ئەگەر کۆڕێ ببەستین
لەم باخە کە وەک جەننەتە جێی مەسکەنی یارە
ئەم شارە کچی حۆری یە کوڕیان هەموو غیلمان
سەیری کە هەمووی شادو گەش و خەندە لە زارە

دوور بی لە بەڵا و ئافەتی ناوەختی زەمانە
ئەم خاک و گەلی کوردە نەیاری بە هەزارە

ساقی قەدەحی مەست و خومارم کە هەمیشە،
دووربم لە خەم و جەورو جەفا و دەردو پەژارە

(١)داماد: زاوا (٢) نەوا: ناڵە ، ئاواز
(٣) ئاهیستە: لەسەرە خۆ

# ڤینۆس

ڤینۆس وێنەی خۆی کێشا بە جوانی
تەنیا ناوی خۆی نا بوو (خوای جوانی)

ڕۆژێک بە ڕێک کەوت لە ڕێگوزاری
چاوی هەڵ ئەنگوت لە نەو نیگاری

هێزی پێ ی نەما هەنگاو هەڵێنێ
ویستی ڕوو بە ڕوو خۆی بۆ بنوێنێ

ئەو ساکە وەستا بەرامبەر بە تۆ
تۆقی بەندەیی تۆی خستە ئەستۆ

سەری دانەواند وەک سەروی سەرکەش
ڕووی سووری زەرد بوو وەک سێوی دڵ ڕەش

لە شۆخی و شەنگی تۆ شەرمەزار بوو
لە بڕیاری خۆی گەلێ بێزار بوو

گوتی: کیژۆڵە پەپوولەی بێ گەرد
بژی بە شادی بێ ئازار و دەرد

بە وێنەی خونچە دەمت کردەوە،
گرەوی جوانیت لە من بردەوە!

بەلقیس و جولێت، شیرین و لەیلا
بۆ کەنیزەییت هاتنە بەر دەرگا

سوێند بە یەزدان و زەند و ئاوێستا
نەم دیوە جوانێک وەک تۆ تا ئێستا

منیش بەم هەموو عیشوە و نازەوە
بەم هەموو نازی بێ ئەندازەوە!!

نەم توانی پیرێک بەند کەم لە داوم
مل کەچ بوەستێ بۆ سیحری چاوم

هەر چەند جوانترین کیژی فەرەنگی
کە هاو تات نی یە لە شۆخ و شەنگی

تۆ وەک من نەکەی لە ڕووی نەزانی
خۆت بە پێشەوای جوانان بزانی

ئەتۆش بەرامبەر نازداری کوردان
دەبیە گوڵاڵەی مانگی جۆزەردان

گەر گەشتێ بکەی لە کوردستانا
بەناو گوڵزار و باخ و بۆستانا!

پۆل پۆل دەبینی کیژی شۆخ و شەنگ
بێ لاف و گەزاف، بێ هەست و بێ دەنگ

هەر کام یەک لەوان ناسکتر لە گوڵ
پەرچەم سوسن و ئەگریجە سونبول

ئەوان جوانترین کیژی جیهانن
بێ کل و کلدان، میکیاج نازانن

گفتوگۆ شیرین، پاک خوو و ڕەوشتن
نموونەی جوانی دەستی سروشتن

نازدار و دولبەر هەم دڵ شکێنن
باجی تەماشا لە چاو دەستێنن!

بەڵام داخەکەم چەرخی بەد پیشە
ڕەشپۆشی بۆ وان کردۆتە پیشە

زیزن لە داخی مەرگی ئازیزان
زستان و بەهار، هاوین، پایزان!

لە هەر چوار وەرزا دیلی بێ دادین،
بێ بەش لە خۆشی و شادی و ئازادین!!

# خەباتی گەلان

## ڤیەتنام

کۆیە ١٢/٤/١٩٦٩

سڵاوی زۆر و چەپکێک گوڵی سوور
دەنێرم لە بۆ خۆر هەڵاتی دوور

سڵاو لە ڤیەتنام مەکۆی دلێران
لانەی نەبەردان، مەڵبەندی شێران

سڵاو لە ڤیەتکۆنگ لەڕێ ی ئازادی
دەجەنگن لە گەڵ هێزی بێ دادی

سڵاو بۆگەلی ڤیەتنامی مەزن
ئازاو نەبەردن هەرگیز نابەزن

هەر چەند زۆریشە ژمارەی دوژمن
فڕۆکەو تانک و ئاگر و ئاسن

بەڵام کار ناکا لە بیرو ئایین
دا نا چڵەکێنێ دڵی پۆڵا یین

سوپای داگیرکەر لە ڕێ ی بێدادی
ناوەستێ لە ڕووی هێزی ئازادی

گەلێ ئاشنای چین و شوورەوی
ئازادی خوازی هەموو ڕووی زەوی

هەموو پشتگیری گەلی ڤیەتنامن
لە قارەمانی ڤیەتکۆنگ سەر سامن

ئیمپریالیزمی خاوەنی دۆلار
هەر دەتوێتەوە وەکو بەفری پار!

ژیان دوا ڕۆژی خۆشی بۆ گەلە
حوکمی سروشتە پێ ی ناوێ پەلە

شەماڵ زوو بە زوو وەک پەیکی ڕەوان
بڕۆ بە پەلە بەبێ پشوودان

بەرەوڤیتنامی بە خوێن سوور کراو
بەرەو ڤیەتنامی گڕ تێ بەر دراو

ئەوسا گەیشتی بە بێ ترس و لەرز
بچووە بارەگای ڤیەتکۆنگی نەبەز

بڵێ: ئەرکی ڕێ ی دوورم کێشاوە
سڵاوی گەلی کوردم هێناوە!!

بۆ ئەو لاوانەی کە چەک لە شانن
گیان بەخت کەری ڕێ ی نیشتمانن

تا بە خوێنی گەش سوور نەبێ وڵات
هەرگیز ئەو گەلە ناگا بە ئاوات

مژدە بێ بڵێ زۆری نەماوە
زۆردار لە دەنگی گەلان ترساوە

چڵی زەیتوون و کۆتری بیکاسۆ
مژدەیی ئاشتی دەگەیێنن بە تۆ

## نامەیەک
## بۆ برا فیدایی یەکانی فەلەستین

کۆیە ١٩٦٩/٢/٢٤

سڵاوی ئێمەی ئازاو و کۆڵ نەدەر
پێشمەرگەی کوردین لە مەیدانی شەڕ

سڵاوی ئێمەی بازوو پۆڵایین
خەباتمان لەلا بووە بە ئایین

سڵاوی ئێمەی مەردو بە هەڵمەت
بە هێرش دوژمن دەکەین لەت و پەت

سەد هەزار سڵاو لە نزیک و دوور
پێشکەش بە گیانی فیدایی جەسوور

سڵاوی ئێمەی برای کوردتان
هەست دەکەین هەموو زام و دەردتان

سڵاوی ئێمەی لە کوردستانا،
لە بەرزترین لووتکەی کێوانا

بۆ برای فیدایی لە فەڵەستینا
لە گەڵ خەباتی سەختی خوێنینا!

له دەردو زاری ئێوه بێزارین
دژی ئیستیعمار، دژی زۆر دارین

ژێر دەستی پیشەی بێ دەسەڵاته
ئازادی بەرهەم ڕەنج و خەباته!

له سەرکەوتنتان شادو دڵخۆشین
کە نسکۆ بێنن زۆر بە پەرۆشین!

خوا لەگەڵ حەقە و ئێوەش حەقدارن
چەوسێنراوەی دەستی زۆر دارن

دەر بەدەر، هەژار، برا کوژراون
خاک داگیر کراو، گیرۆدەی داون

بەڵام لەو ڕۆژەی شۆڕش دەگێڕن
خاکی وڵاتتان بە خوێن دە دێرن!

بە هەڵمەت بردن وەک شێری شەرزە
دوژمن لە ترسان کەوتۆتە لەرزە

هەر گەلێک لە ڕێ ی ماف بەدەست هێنان
نە ترسێ لە مەرگ لە کۆت و زیندان

ئەم گەلە دەژی نامرێ ناوی
وەر دەگرێتەوە مافی خوراوی

لا پەڕەی مێژووی نزیک و دووری
بنووسێتەوە بە خوێنی سووری

بە لێ ئەو گەلە شیاوی ژینه،
خەباتی سەختی هەمووی خوێنینه

ئەگەر دەستم بێ برای فیدایی
بەڵێن بێ بەبێ فەرق و جودایی

وەک برای دڵسۆز من دێم بۆ یاریت
خوێنم دەڕژێنم لە ڕێ ی ڕزگاریت

دەبم بە هاوڕێ ی سەختی خەباتت
تا دەگاتە جێ هەموو ئاواتت

ئەم ئاواتەی تۆ کە ئازادی یە
وەک تۆ بۆ منیش مایەی شادی یە

وای پێشان داوە مێژووی ڕابوردوو
ڕژاو تێکەڵ بوو، خوێنی من و توو

خۆشەڕی سەلیب هەر لەبەر چاوە
لە زۆر جێ ئێستاش ئاساری ماوە

کوردم من نەوەی سەلاحەددینم
برای بە وەفای عەهدی دێرینم!

برای فیدایی نەک هەر من تەنیا
بۆت بە پەرۆشم وەک باوک و برا

هەموو ئازادی خوازانی جیهان
پشتیوانی تۆن وەک من بێ گومان

برای فیدایی قۆڵ تێک هەڵکێشین
تا ڕیشەی دوژمن لە بن دەرکێشین

دەست لە ناو دەست کەین پشت بە خوا بەستین
هەردوو عەوداڵی شوێن یەک مەبەستین!

من بۆ کوردستان، تۆ بۆ فەلەستین
تا ڕزگار دەبن هیچ ڕا نەوەستین

تۆ بۆ من برای منیش براتم،
بۆیە ڕزگاریت بۆتە ئاواتم!

هیوای ڕزگاری گشت فەلەستینە،
لە دەست سەهیۆنی پیسی لە عینە!

مژدە بێ مژدە مژدەی سەرکەوتن
نزیکە ڕۆژی دوژمن دەرکردن

ئەمجا پێکەوە لە قودسی پیرۆز،
بە یەکتر دەڵێین جەژنمان پیرۆز!!

## فەلەستین

١٩٨٦/١٢/٤

وەرن ئەی شۆڕشگێڕانی فەلەستین،
لە پێناو چارەنووس کۆڕێ ببەستین

هەموو داگیرکەرانی ئێمە یەک سەر
بە زەحمەت ببتە چوار ملیۆن بە دەفتەر

نفووسی گشت عەرەب بکرێت ژمارە
سەدو پەنجاو دوو ملیۆن دیارە

لە بیست دەوڵەت زیاتر خۆ دەزانن
هەموو خاوەن سوپا و هێزو کیانن

لە وانە کامی دۆستی زایۆنیزمە،
لەناو بۆتەی عەرەب کەم نرخ و نزمە!

ئەوانە ڕوو ڕەش و بەدکار و گێژن
لە جیاتی یارمەتی خوێنم دەڕێژن!

ئەگەر داگیرکەران چەند خوێن بڕێژن
سزای بەدکاریی خۆیان هەر دەچێژن

لە زۆر خاکی عەرەب نزیک وەیادوور
تەماشا چۆن بە خوێنی من کرا سوور

چ هێزێک ناتوانێ بم شکێنێ،
لە ڕاست دوژمن بە چۆکم دابهێنێ!

ئەوەندە خوێن دەڕێژم بێتە لافاو
کە دوژمن وەک پەڵاش بێنێتە سەر ئاو

سەر و ماڵ و ژن و منداڵی ساوا
بە گڵپەی ئاگری دوژمن سوتاوا

دروشمێکم هەیە من کۆڵ نەدانە
هەتا سەرکەوتنم هەربێ وچانە

خودا یاربێ بە یاریدەی برایان
بە سەرکەوتن دەبێ جەنگ بێتە پایان

دەبێ ئاڵای فەلەستین هەڵ شەکا بێ
بە خوێن ئازادی تێ دا نووسرابێ

ریکاردۆسێکی تر هێرش بهێنێ
سەلاحەددینێ ماوە بی شکێنێ!!

تێبینی:
(١) ئەم هۆنراوەیە بە زمانی تێکۆشەرێکی فەلەستینی گتراوە.
(٢) ڕیکاردۆس لە شەڕی خاچ پەرستەکان سەرکردەی سوپای فەرەنگەکان بوو.

# سەر گوزشتەی مام ڕێوی و ورچ

ساڵ کژی پایز لە ئاخە لێوە
هەڵی کرد سەرماو بەفرو کرێوە

مام ڕێوی خۆی و لەگەڵ سێ بێچوو
دەگەڕا شوێنێک دابین بکا زوو

کە لە زستاندا لێ ی دڵنیا بن
دوور لە ئاژاوەو دەردو بەڵا بن

بەرەنگاریان بوو ورچێکی سەرچل
ئەویش لەگەڵیا سێ بێچووی سەر زل

ڕێوی لێ ی پرسی ئەی گەورەی زانا
خاوەن دەسەڵات هێزو توانا

من وا خەریکم بۆ ئەم زستانە
شوێنێک پەیدا کەم بیکەم بە لانە

ئەی ئێوە بەڕێز لەگەڵ بێچووەکان
لە چی دەگەڕێن وێڵ و سەرگەردان

ڕووی کردە ڕێوی ورچی هیچ نەزان
گوتی: وا منیش لە ترسی زستان

ئاوارە بووم لەم دەشت و چۆڵە
وا دەپشکنم ئەم هەردەو دۆڵە!

شوێنێک پەیدا کەم تێ ی دا ستار بین
لە سەرماو سۆڵەی زستان ڕزگاربین

مام ڕێوی پێ ی گوت: بەڵەد نی لێرە
تۆ ئەم خزمەتە بەمن بسپێرە!!

من زۆر شارەزام لە کێو و مەرزە
ئەشکەوتێک هەیە لەم شاخە بەرزە

هەردووک وەک برا بۆ ئەم زستانە
بچین دروست کەین ئارامگەو لانە!

پەیمان ببەستین هەروەک یەک خێزان
پێکەوە بژین تا دوایی زستان!!

ئەتۆ بگەڕێ لە ڕاوو شکار،
من لە ماڵ دەبم بۆ خزمەت گوزار!

ماوەی چەند ڕۆژێک وایان بەسەر برد
تا ڕۆژێک سەرماو تۆفان هەڵی کرد

ورچە ئەو ڕۆژە هەر چەند خەریک بوو
بۆ ماڵ گەڕاوە چی دەستگیر نە بوو!

شەو گار درێژ بوو هەر نەبڕایەوە
بە زگی برسی سەریان نایەوە

دیسان بەیانی بۆڕاوو شکار
ورچە کەوتە ڕێ بە دڵێکی خەمبار

ئەمجا مام ڕێوی لەگەڵ بە چکەکان
پیلانی ڕێکخست دژی ورچەکان

کردیان بە گاڵە ها بردی بردی
بە چکە ورچێکیان برد بۆ پشت گردی

بە بێ ڕاوەستان ورگیان هەڵدڕاند
بە هەر سێ و چوار گۆشتەکەیان خوارد

ورچە ئێوارە لە ڕاو گەڕاوە،
دیتی مام ڕێوی لە ڕێ وەستاوە

دڵی خوورپەی کرد پرسی ها خێرە
وا بە خەمباری وەستاوی لێرە!

مام ڕێوی گوتی: جەرگم بڕاوە
لە بێچووەکانمان یەکێک خوراوە

ورچە لێ ی پرسی لەوانەی تووە
مام ڕێوی گوتی: لەبیرم چووە!

فەرقیان ناکەم هی کامە مانە!
بەڵام وا دیار بوو سەر زلەکانە

گەڕانەوە ماڵ بە دڵی خەمگین
ئەو شەوە کردیان بە گریان وشین

چەند ڕۆژ تێپەڕی لەم فەند و فێڵە
دیسان هەڵیکرد سەرماو ڕەهێڵە!

ڕێوی ئەمجارەش وەک جاری پێشوو
شانۆگەریەکەی هێنایەوە ڕوو!!

بەهار دیاری دا بە سەرچوو زستان
دیسان مام ڕێوی لەگەڵ بێچوەکان

لەسەر زلەکان هەر یەکێک مابوو
ئەستێرەی ژینی ئەویش ئاوابوو

ڕێوی شاردی یەوە گشت بە چکەکانی
لە شوێنێکی وا هیچ کەس نەزانی

ئەمجا گەڕاوە سەر ڕێگای پێشوو،
بە هەمان گەزو و کێش و تەرازوو

ورچە لێ پرسی هی کامەمانە؟
مام ڕێوی گوتی: سەر زلەکانە!

لە ڕاستی بۆ خۆت زۆر زۆر دڵ پیسی
بۆیە هەموو جار وام لێ دەپرسی

هی تۆ یان هی خۆم بێ درۆ کردن
ڕۆژێک لە ڕۆژان فەرقم نەکردن

بەڵام لەگەڵ هی وەک تۆ برایەتی
سەر دەکێشێتە دوژمنایەتی

ئەوا ڕۆیشتم وازت لێ دێنم
بەڵێن بێ ئیتر قەت نەت دوێنم!!

# ڕێوی و دەهۆڵ

لە نزیک گوندێک شایی و لۆغان بوو
پیاوێک کە پیشەی دەهۆڵ لێدان بوو

بە خۆشی و شادی وبەزم و گۆرانی
شایی دەگێڕا شەو تا بەیانی

شایی تەواو بوو وەک هەموو جارێک
دەهۆڵی خستە ژێر لقی دارێک

ڕۆژێک مام ڕێوی بە شادی و دەماخ
لە گەشت دەگەڕا ، لە بێستان و باخ

ڕۆیشت گەیشتە دارستانی چڕ
دەنگێکی گەورەی هاتە گوێ لە پڕ

ڕێوی وای زانی پیلان و داوە!
تایبەت بۆ کەوڵی ڕێوی کراوە

لە ترسان خێرا کەوتە ڕاکردن،
تا گیان ڕزگار کا لەدەستی مردن

ڕای کرد ماندوو بوو هەڵوێستێکی کرد
ئاوڕێکی داوە سەری بڵند کرد

هیچ کەسی نەدیت کە بێ بە شوێنی
فێڵبازە ڕێوی کەوتە تێ بینی!!

دەمێک پشووی دا تا حەسایەوە،
لەو ڕێگەی هاتبوو ڕاست گەڕایەوە

چوو بۆ شوێنی دەنگ هێندەی نە کێشا
شتێک سەرنجی ڕێوی ڕاکێشا

گوتی: بە دیمەن گەورەو مەزنە
لە ڕواڵەت دا پێستی بزنە!!

یا خود قاورمەی خاوەن بێستانە
حەشاری داوە لەم دارستانە!!

هەڵمەتی بۆ برد قوڵی هەڵماڵی
دۆڵ دڕا دیتی ناو زگی خاڵی

کە ئەمەی بینی ڕێوی حەپەسا ،
گوتی: من تازە بووم بە مامۆستا!!

پەیکەری گەورە، بۆش و بەتاڵە
مەسەلەی کوردە چەند هەزار ساڵە

## سەرگوزشتەی ورچ و مەیموون

کۆیە ١٩٧٠

لە ڕابوردوو دا وەها ڕووی داوە
ئەم بەسەرهاتە وا باس کراوە

لە وڵاتێکی خۆش ئاو و هەوا
ڕەگەزی مەیموون بە خۆشی دەژیا

وڵاتێکی خۆش فێنک بە میوە
وێنەی بەهەشت بوو لە هەموو شێوە

کانی و سەرچاوەی هەمووی لا لەزار
وەرزی پاییزی خۆشتر لە بەهار

خاکی خۆیان بوو زۆر ئاشکرا بوو
پشت بە پشت لە کۆن بۆیان جێما بوو

لە سنووری وان هێندێک بەرەو خوار
وڵاتێک هەبوو وشک و گەرمەسار

ناوی ئەو شوێنە ورچ ئاوا بوو،
وڵاتێکی زۆر وشک و گەرما بوو

ڕۆژێک لە ڕۆژان ورچێک لە برسان
سنوور بە زیی کرد هات بۆ دارستان

هاتە ناو خاکی خۆشی بۆ زینە
کە وەک بەهەشتی خولدی بەرینە

ورچی چاو برسی وتی: ئەم خاکە،
بۆ مەیموون ناشێ، بۆ ئێمە چاکە

زۆری خوارد میوە و بەری دارانی
تێر بوو گەڕاوە بۆ لای خوێشانی
گوتیان: لە کوێ بووی بێ باس و خەبەر
ئێمە لێت گەڕاین هەموو دەشت و دەر

گوتی: بەڕاستی ئیمڕۆ لە گەشت بووم
نەک لەسەر زەوی لە ناو بە هەشت بووم

ڕێکەوت هەڵەم کرد لێرە بەم لاوە
داری میوەیە و سەرچاوەی ئاوە!

وڵاتێکی خۆش، زۆر سازگارە،
چوار وەرزی ساڵی هەموو بەهارە

ڕەگەزی مەیموون دەژی لەم دەشتە،
ئەو دەشتەی وەکو باخی بە هەشتە

ئێمەش لەم دێمە و لەم گەرمە سارە
هیچ لێ نە هاتووین، برسی و ئاوارە

مەیموون بچووک و بێ دەسەڵاتن!
لەو پەڕی شادی و خۆشی و ئاواتن

ئێمەش بە دیمەن گەورەو بە کارین
کە چی هەمیشە برسی و هەژارین

پێویستە هەموو هێرشێک بەرین
چ مەیموون هەیە لە ناوی بەرین

بیکەین بە خاک و وڵاتی خۆمان
مادام بە هێزین، دەگونجێ بۆمان

پۆڵ پۆڵ دەهاتن، بوو بە جەماوەر
گوتیان: ئەتۆمان وا کرد بە ڕابەر

هەرچی تۆ بڵێی زۆر زۆر بە جێ یە
هەر ئەمر بکە، سەرمان لە ڕێ یە!

گوتی: پێویسته هەر بە (شەبەی خوون)١
قەڵا چۆ بکەین ڕەگەزی مەیموون!!

لە شکر کەوتە ڕێ هات بۆ دارستان
ئابلووقەیان دا دەمی بەر بەیان

بوو بە شەڕو شۆڕ هاوار و کوشتار
لە مەیموون کوژراو گەیشتە هەزار

پەڕاگەندە بوون، پەرت و ئاوارە
هەندێک زامدار و هەندێک بێ چارە

کوڕ لەگەڵ باوک ، برا لەگەڵ برا
منداڵ ودایک لە یەک دابڕا

بە شەپرزەیی و سەر لێ شێواوی،
بە ماڵ وێران بوون بە لێ قەوماوی

بە شادی و خۆشی ورچی بەد کردار
بوون بە خاوەنی باخ و مێرغوزار!!

دانای نا تەوان تەوانا دەبێ
تەوانای نەزان، نا تەوان دەبێ

پاش ئەم ڕووداوە و ئەو بەسەرهاتە
مەیموون کەوتنە خۆ بە ماتە

بۆ پیلان دانان بۆ ڕاوو تەگبیر
بۆ ڕێک و پێکی هاتن بۆلای پیر

سەرۆکی مەیموون کەم هێز و پیر بوو
بەڵام زۆر زانا و دوور بین و ژیر بوو

گوتی: برادەران! ئێوە :گوێ بگرن
نرخی گرانە پەندم لێ بگرن!

لێم دەن بە لیس و بە بەرد و بەدار
خوێن لە سەرو گوێم بچۆڕێتە خوار

دەست وپێم بشکێ، پشتم زامدار بێ
نا بێ هیچ کامتان بۆم خەفەتبار بێ

ئەمجا تکایە بەبێ گیر و دار
بم بەن فڕێم دەن لە نزیکی شار

گەورە لە پێناو گەلی هەژاری
خۆی بەخت نەکا نابێ ڕزگاری

چوار ڕۆژ پاش ئێستا بەڵێن بێ بۆتان
بگەڕێنەوە وڵاتی خۆتان!!

هەرچی پێ ی گوتن چۆن بڕیار درا
فەرمانی سەرۆک جێ بە جێ کرا!

کاتی خۆر کەوتن گزنگی هەتاو
ورچێکی پیرە دەهات بۆ سەر ئاو

مەیموونێکی دیت سەرو ودەست شکاو
هاواری دەکرد برا کەس نەماو

ورچە ئەمەی دیت گەڕاوە بۆ شار
ئەوەی دیت بووی گوتی بە سەردار

سەردار ئەمری کرد ورچێک دەست و برد
بە ڕاکردن چوو مەیموونی هاورد

ڕووی کردە مەیموون ورچ بە وردی
پرسی پێم بڵێ: کێ وای لێ کردی؟

مەیموون گوتی پێ ی: گەورەی گەورانم
بە جێم هێناوە ئەرکی سەرشانم

لەڕێ ی ئێوەدا وا دەر بەدەر بووم
تووشی کڵۆڵی و ڕەنج و کەسەر بووم

ورچ پێ ی گوت: مەگەر کارێک رووی داوە
بۆم بگێڕەوە لە سەرەتاوە،

گوتی: گەورەی خۆم لێت ناشارمەوە
ئەوەی کە دیومە ،بۆت دەگێڕمەوە

لە پاش ئەو شەوە کە ئێوەی بەکار
هێرشتان هێنا بوون بە گەورەی شار

مەیموون کەوتوونە خۆ کۆکردنەوە،
بۆ هەڵمەت هێنان، تۆڵە سەندنەوە

سوپایان زۆر تر لە بیست هەزارە
دوو شەوی ماوەی هێرش بڕیارە

هاتم بە ئێوە بڵێم کارەسات
وەکو دم بینی وەهام بەسەر هات

وتیان سیخورە ئەم پیرە بۆزە
دژی نەتەوەو ڕەگەزو هۆزە!!

پیرە ورچ دەمێک کەوتە بیر کردن
سەری هەڵبڕی بۆ تەگبیر کردن!

گوتی: سەر لەشکر بانگ کەن بە پەلە
تاکو لەدەستمان نەچووە ئەم هەلە!

دەبێ هەر ئێمەشەو هێرشێک بەرین
تا کیان لێ ببڕین لە ناویان بەرین

دەنگ درا لە شار، بڕیار وەها بوو
لەشکر بە ڕێ بێ کە خۆر ئاوا بوو

بە مەیموونی گوت: تۆش بەزانایی
لە گەڵمان وەرە بۆ شارەزایی

هەر چەند زامدار و کەم هێزو پیری
بەڵام بە وەفاو و دڵسۆز و ژیری

ئەمرەکەم ورچێک بتکاتە سەر شان
لە پێشەوە بی بۆ ڕێ نیشاندان

مەیموون لە وەڵام گوتی: «بەجێ یە
بۆ خۆشی ئێوە سەرم لە ڕێ یە!»

لە شکر کەوتە ڕێ مەیموون ڕابەر بوو
هەر خۆی دەیزانی ، چی لە ژێر سەر بوو

ڕووی کردە چۆڵێک وشک ودێمە کار
شەو تا بەیانی ڕۆیشتن بە غار

پێش خـــــۆر هەڵاتـن بـەیـان ڕووناک بـوو
لەشکر شـــپـــرزە و مـــاندوو وهیـــلاک بوو

ورچێکی بـایـی ڕووی کــــردە مــــەیموون
کــوان لە کــوێن تاکـــو بیـــان کــەین زەبوون؟

مــەیموون پێ ی گــوتن: ئەی قــوڕتان بەســەر
بـۆ مـــــەرگی ئـێـــــوە، بـووم بـە ڕابـەر!!

بـوەستن هـەتـا خـــــۆر ســـــەر دەردێنێ
گــــەرمـــا جــۆرێکـە دەمـــان ســـووتێنێ!

لـەگــــــەڵ ئـێـــــوەدا هـاتم بـۆ مـــــردن
بمرم لـەڕێگـای گــــەل ڕزگــــار کــــردن

گــیـــان ڕزگـــار ناکـــەن لەم دەشت و چۆڵە
کـــەســێک زۆڵ نـەبێ دەســـتـــێنێ تۆڵـە

پاش ئەوەی مــــەیموون بێ ترس وەســـتـــان
گـــــەڕانەوە نـاو شـــارو دارســـتـــان

ئـیــــدی ئـەو ڕۆژەی وەکــــو یـادگــــار
هەمـــوو ســـاڵ جــەژنە بە یادی ســـەردار!!

(١) شەبەی خوون: هێرش بردنی بەشەو.
(*) لە کەلیلەو دمنەوە بە شیعر کراوە بە کوردی و لە ڕۆژی ١٦/١/١٩٧٠دا تەواو بووە.

## پیرێک

پـیــــــرێـک دەڕۆیشـت لـە ڕێـگـوزارێ
بـە ڕەنـگـاری بـوون چـەنـد هـەرزەکــــارێ

پـیـــر تـەمــــاشــــای کــرد بەم لاو بەم لاوە
هەڵوێســتــێکی کــرد مـاندووی حـەساوە

ســـەری هەڵبـــڕی بـە ڕووی ئـاســـمــــان
لەڕووی هاتە خــوار فــرمــێـسکی گـریـان

لاوێک لێ ی پرسی ئەی پیری زانا
چیت ون کردووە لە ڕووی جیهانا ؟

وا ماندوو و شەکەت بۆی بە پەرۆشی
ناکرێ چاوی گەر لێ بپۆشی!!

پیر بە پێکەنین تەماشای کردن
لە بیرم ناچێ تا ڕۆژی مردن

بە نرخترین کالا و سەرمایە!
لە کیسم چووە، لە دەستم دایە!!

یەک (تەندروستی ) دووەم (لاوێنی)
ناگەڕێنەوە خۆی بۆ بمرێنی!

ڕۆڵە ئەگەر تۆش نەمری بە لاوی
ڕۆژێک دێت وەک من دەکەونە داوی

بەر لەوەی تەمەن بڕوا بێ هوودە
نرخی بزانی یە کجار بە سوودە

کە دەوری گرتی پیری و نەخۆشی
ڕزگاریت نابێ هەر چەند بکۆشی

چیت بۆ ناکرێ بە خۆزیا و بریا
یاسای سروشتە وەها دا نرا!

ئەگەر زۆر زاناو ژیر و هوشیاری
بگرە گوێ، پەندم بۆ ئامۆژگاری!

خۆش ڕابوێرە ماوەی ژیانت
ڕێزت لێ بگرن هاو نیشتمانت

ئەمە سەرمایەی دین و دنیایە!!
جێ ی ڕەزا مەندیی خەڵک و خودایە!

# مامەی لادێی

ڕۆژێک بەیانی بەر لە خۆر هەڵات
مامە لادێی ڕوو بەرەو شار هات

کەم هێزوو ماندوو کفت و شەکەت بوو
سەرو ڕیش بە تۆز دڵ پڕ خەفەت بوو

سڵاوی کرد لێم، وەڵام سەد سڵاو
زۆر بەخێر هاتی مامی قەد چەماو

- بۆچ وا پەشێوی چیت لێ قەوماوە
نەژدە لێ ی دای یانماڵت سووتاوە؟

- نە نەژدە لێ ی دام، نە ماڵ سووتاوم
بۆ خزمەت شێخە یەکجار بە تاوم

- مەبەستت کام شێخە؟ (حاجی شێخ بابە)
شێخو مە شایخ عالی جەنابە!!

- بۆچ وا بە پەلە، وا بێ ئارامی؟
- هەر بۆ زیارەت زاتی کیرامی!!

کوڕم نە خۆشە هاتووم بۆ نووشتە
بۆ هەموو دەردێک دەرمانی گشتە!

- دیارە ئەرکی ڕێ ی دوورت کێشاوە
دیاری و بەراتت بۆ شێخ هێناوە؟

- هەرچی بۆی بەرم بۆ شێخ شایستە
چونکە لەلای خوا زۆر خۆشەویستە

دوعای یەک بە یەک وەک پەنسلینە،
دەرمانی هەموو دەردو برینە!

پێم گوت: مامە گیان توو بەشقی خودا
کەی بۆتە دەرمان کشتەک و دوعا

کوڕەکەت بەرە بۆ نەخۆشخانە،
هەموو پزیشکەو پڕ لە دەرمانە

دوکتور بیبینی دەردی دەزانی
زوو چاری دەکا زۆر بە ئاسانی

کەی نووشتە و کشتەک دەرمانی دەردە
تاکەی تێ ناگا خوایە ئەم دەردە؟!

پێم گوت: مامە گیان حاجی شێخ بابا
ئەو زاتەی بێ بەش لە هەموو بابا

غەیری دەست برین بە فریب بردن
سوێندت بۆدەخۆم چی بۆ نەکردن

بۆ خۆی نەخۆش بێ شێخی جادوو کەر
بۆ نەخۆشخانە ڕادەکا یەکسەر

ئەی بۆچی بۆ خۆی ڕۆژێک لە ڕۆژان
کشتەک و دوعا ناکا بە دەرمان؟!

فەرموو با بچین بۆ نەخۆشخانە،
بۆ خزمەت شێخی ورگ هەمانە

ئەوە چەند ڕۆژە بۆ چارەو دەرمان
لە وێ کەوتووە شێخی هیچ نەزان

مامە کە بینی لە نەخۆشخانە
شێخیش موحتاجی دەواو دەرمانە

مامەی لادێیی لە شوێن خۆی وەستا
کە شێخی بینی مات بوو حەپەسا

گوتی: «سەد لەعنەت لەو شێخ و پیرە
لە پەنای دین دا پیشەی تەزویرە!!

# مارو باخەوان

ئەی برادەر خۆت دەزانی بێ گومان
سەرگوزشتەی مارو مامەی باخەوان

باخەوان ڕەش پۆش بوو بۆ مەرگی کوڕی
مار بە دەستی باخەوان کلکی پەڕی

باخەوان ڕووی کردە مار «ئاشت بینەوە
هەرچی بوو چوو ئێستە هێور بینەوە!!»

مارگوتی: « ئەی باخەوان تۆ درۆزنی
من هەمیشە بێت دەڵێم تۆم دوژمنی

من کوڕی تۆم کوشت و جەرگی تۆم بڕی
هەر بەدەستی تۆ بوو من کلکم پەڕی!!

ئاشنا بووغان بە یەکتر بێ گومان
جێ ی گومانە جێ ی گومانە جێ ی گومان!!

کلکی خۆم هیچ دەم لە بیر نا چێتەوە،
حەقتە تۆش بۆ ڕۆڵەکەت سوێت بێتەوە

دڵنیا بووغان لە یەکتر گەوجی یە
تۆڵە ساندن فەلسەفەی بێ مەرجی یە!!»

# گوڵ و بولبول

گوڵی پشکوتوو بۆ بولبول
هەڵی ڕشت ڕازو نیازی دڵ

گازاندەی کرد لە خاوەنی
باخی ڕازاوەو گوڵشەنی

ئەمەی وت ئاخی هەڵکێشا،
جەرگ و دڵی لەگەڵ ئێشا!

-: « باخەوان ئەوەی مەبەستە
دەستم ببەستی بە دەستەتە

بمبا بۆ کووچە و بازاڕان
بکەومە دەست هەرزە کاران

بە پوولی کەم بم فرۆشێ
تاڵی مەرگم پێ بنۆشێ!

سیس و ژاکاو هەڵ بوەرم
زوو بێت مەرگی کت و پڕم!!

- گەردو گێژە لووکەی خەزان
لە تۆش زوو تاڵ دەکا ژیان

لانەو مەرزت دەشێوێنێ
گەڵای باخان دەوەرێنێ

گوڵ نامێنێ لەسەر چڵان
تێک دەچێ لانەی بولبولان

سەرمای کوشندەو ڕەشەبا
وێنەی دێڵە گورگی بە با

ڕووی کردە هەر جێگاو مەرزێ
گیان لەبەر تێ ی دا دەلەرزێ

لە تەختی گوڵ، چقڵ و دڕوو
لە جێی هوزار، قەلی بەد خوو

ئەم بە تیژی و زەخم گازی
ئەم بە ئاوازەی ناسازی

ئەو زام بەخش، ئەو ڕووی ڕەشە
ڕۆژ ڕۆژی خوێڕی و ڕوو ڕەشە

# بازرگان و توتی

١٩٨٥/٣/١٩

وا دەگێڕنەوە لە ڕۆژگارێک
تاجیرێک هەبوو لە گەورە شارێک

ڕۆژێک لە ڕۆژان لەگەڵ خێزانی
وتو وێژیان بوو بە شادمانی

گوتی: «من دەڕۆم بۆ سەفەری دوور
پڕ مەترسیی یەو لەو پەڕی سنوور!!

کە گەڕامەوە شادو بەختەوەر
چیتان بۆ بێنم دیاری ی سەفەر

هەر یەک پێویستی چی بوو بۆی نووسی
سەفەرت خێر بێ دوور لە مەترسی

تووتی یەکی هەبوو کاکی بازرگان
قەفەزی زێڕی بۆ کردبوو بە لان

ڕووی کردە تووتی: ئەتۆ چیت دەوێ؟
شەرت بێ بۆت بێنم گەر دەستم کەوێ

تووتی ڕووی کردە ئاغای بازرگان
بەڵێنم دەیە بە دڵ و بە گیان

بازرگان گوتی: « تووتی بەڵێن بێ
بۆتی دەهێنم لەهەر جێ و شوێن بێ»

تووتیەکە گوتی : «لە دوورگەی خاوەر
لە خۆر هەڵاتی دوورگە لە ئەو بەر

هێلانەی دایکم لەسەر دارێکە
بۆم سۆراخ بکە لە چ حاڵێکە

سەفەرت خێر بێ بە شادمانی
بگەڕێیەوە بۆ ناو خێزانی

لە دوای چەند ڕۆژێک ئەم بازرگانە
کەوتە ڕێ لەگەڵ بارگەو بارخانە

له گێتی گیانی هاتی به ڕێک کەوت
سەرسام له پێنج و چوار و شەش و حەوت
مەست به نازانی له کوێوه هاتووی
ناش زانی بۆ کوێت دەبا چەرخی چەوت؟

***

ئەم کەونه کاتێک هاته کایەوه
هەر کەس به جۆرێ لێکی دایەوه
بەڵام تا ئێستا له ڕوویی ڕاستی
هیچ کەس نەی زانی هەروا مایەوه!!

***

ئەم کۆنه سەرای که گێتی ناوه
جێگای سانەوەو تاریکی و تاوه
شانشینێکه تەختی بەهرامه
بەزمێکه جەمشید سەری سوڕماوه

***

ئەم دوو سێ ڕۆژی ژینی ڕابردوو
وەک ئاوی جۆگا و گەردو بای دەشت بوو
خەمی دوو ڕۆژم به یاد دا نەهات
ڕۆژی ڕۆیشتوو ڕۆژی نەهاتوو!

***

بەر لەمن و تۆ چی بوو چی نەبوو
شتێک پێویسته بیزانی ئەتوو
هەرچی پێ دەنێ بەسەر ڕووی زەوی
بیلبیلەی چاوی جوانێکه وەک توو

***

بەرد به ڕووی دەریا تاکەی باوێژم
بۆ بت پەرست، کەنیشت، چ بێژم؟
کێ دەڵێت خەیام جێ ی ناو ئاگره؟
ئاگری بەهەشت، کێ چوو، هات، بێژم؟

***

ئەم پیاڵه به ئەرک دروست کراوه
مەست بۆ شکانی فتوای نەداوه
دەست و سەرو پێ ی چەند نازەنینه
بەرهەم هات بەناز بەقین شکاوه

***

ئاونگی نەورۆز شووشتی ڕووی لاله
مەی گێر بۆم پڕ که جام و پیاڵه
ئەم سەوزه زارەی فەرشی ژێر پێ یه
ئێمەش که مردین ئەوەمان حاڵه

***

نەورۆز پیاڵەت پڕ مەی گوڵ ڕەنگ بێ
هاوڕیت جوانێکی زۆر شۆخ و شەنگ بێ
مەی نۆش کەو شاد بە ئەم کۆنە چەرخە
دەت دا بە خاکا زوو یا درەنگ بێ

***

چەرخ بەئارەزووی هونەرمەند نەبوو
حەفت بێ یان هەشت بێ فەلەک لەلای توو
بمرین بەر لەوەی پێک بێ ئارەزوو
چ گورگ بمان خوا چ مارو مێروو!

***

خاکەکەی ژێر پێ ی هەر هەرزەکارێ
پەنجەی شۆخێکە و گۆنای نازدارێ
هەر خشتێ لەسەر چینی دیوارێ،
دەستی وەزیرە و سەری سەردارێ!

***

خوا کە مرۆڤی دروست کرد بە ناو
بە وێنەی ئێستا هێنایە بەر چاو
گەر ڕێک و پێکە بۆ دەی شکێنی
گەر ناتەواوە کێ یە لێ پرساو!!

***

کەس لە نهێنی سروشت تێ نا گا
تەنیا گیان نەبێ هیچ کەس پێ ناگا
جێ ی سانەوەمان ناو جەرگەی خاکە
مەست بە هیچ کەس لەم چیرۆکە ناگا!

***

نوست بووم مەردێک لە خەو پێمی گووت
خونچەی شادی کەس لە خەو نەپشکووت
مەست بە بێ گومان ژێر خاکە جێگەت
هاودەمت مەرگەو ئەجەل دێتە دووت

***

لەو جغزەی ئێمە کە لێ ی دەر دەچین
نەسەری دیارەو نە دووایی یەقین
لە ڕوویی ڕاستی، هیچ کەس نازانێ
لە کوێ وە هاتین لە بۆ کوێ دەچین؟

***

گەر پەری ڕوویێک وەرزی بەهارێ
جامێک مەی بدات پێم لە گوڵزارێ
هەر چەند لەلای خەڵک زۆر ناشیرینە
نا مەرد بم ناوی بە هەشت بەم جارێ

***

ڕێک کەوت ڕێم کەوتە کارگەی گۆزگەر
دیم لە دەوری چەرخ وەستای پڕ هونەر
لە کەللەی پاشا و لەدەستی وەزیر
بۆ گۆزەی دەکرد ، مل و دەست و سەر

***

گیانە با نە خۆین خەمی بەیانی
بژمێرین کاتی ژین بە هەرزانی
هاو ڕێگای مردووی سەد هەزارساڵەین
کە مردین سبەی بەبێ گومانی

**

هەروەک نەبوونە بوونی ئەلەستی
ژینی پڕ گومان دانیشی پەستی
جامێ وەرگرین لەم خەرا باتە
بێ ئاگا دەمرن هوشیار ومەستی

***

ساقی سەوزەو گوڵ زۆر شادمانن
چەند ڕۆژێک دەژین، بەرەو نەمانن
هەڵسە بخۆوە تا چاو بڕ دەکا
سەوزە بوویتە پووش گوڵ داوەرانن

***

ڕابردووی ژینم پڕ تاڵی و خەم بوو
ناخۆشیم زۆر و شادیم کەم بوو
سوپاس بۆ یەزدان هۆی دەردو بەڵا
هەر چەند پێویست بوو لەلای خۆم جەم بوو

***

بەهار لە چیمەن گۆشەی گوڵزارێ
دانیشتن لەگەڵ شۆخی نازدارێ
بێنە پیاڵە مەستانی سەحەر
دڵنیای مزگەوت و کڵیسان جارێ!

***

نازانم وەستای ئەلەست دای ڕشتم
دۆزەخیم یاخۆ شیاوی بەهەشتم
بادەو ساز و یار لە مێر خوزارێ
بۆ من بێ ، بۆتۆ، کاخی بەهەشتم

**

پەردەی تاریکی دڕی مانگە شەو
مەی نۆش کەین چاکتر دەست ناکەوێ لەو
مەترسێ شاد بە زۆر جار مانگە شەو
لەسەر گۆڕمان پەرت دەکا پڕتەو!!

**

سەرخۆشی و شادی خواهیشتی خۆمە
دوور لە کفر و دین ڕەوشتی خۆمە
پرسیم لە بووکی گێتی مارەییت
گوتی دڵ خۆشییت مارەیی خۆمە!!

**

مەی ڕەنگ ئەرخەوان گۆزە کانیتی
پەیکەر، پیاڵە، شەڕاب، کانیتی
ئەو بادەی بەمەی دێتە پێکەنین
شار دراوەی خوێنی کاوە کانیتی

**

بخۆوە بادە بژی مەستانە
دەست کەوتی لاوی و مایەی ژیانە
کاتی بادەو گوڵ یاران سەرخۆشن
دڵ خۆش و شاد بە ئەوەت ژیانە

**

چاکی و خراپی مرۆڤ پەیوەستە
شادی، خەمباری، کاری ئەلەستە
گلەیی چی دەکەی لە چەرخی گەردوون
چەرخیش وەکو تۆ لەم کارە پەستە!

**

لەهەر جێ باخ و لالە زارێکە
لە خوێنی سووری شەهر یارێکە
لە خاک وەنەوشە کە سەر دەربێنێ
خاڵی سەر گۆنای نەو نیگارێکە

**

ژیان دوایی دێت چ شیرین چ تاڵ
پیاڵە پڕ بی، حەرام بێ، حەلاڵ
مەی نۆش کەین کە مانگ لە پاش من و تۆ
هیلالی جغزە، جغزیشی هیلال

**

ئەوانەی زیرەک کە زۆر زانابوون
لە زانین لای خەڵک وێنەی چرا بوون
لە شەوی تاریک ڕێگەیان گوم کرد
چیرۆکیان دەخوێند، خەوتن ئاوابوون

**

ئەوانەی بۆ چۆل ڕۆیین سەرگەردان
کاریان بە جێ بوو، ڕەوشتیان جوان
بەهانە دەگرن ئیمرۆ بێ گومان
سبەینێ هەر ئەو دروستە و ڕەوان

**

ئەوانەی کۆنن، ئەمانەی تازە
هەر یەک خەریکی ڕاز و نیازە
گیتی هەتا سەر نامێنێ بۆ کەس
ڕۆیشتن، دەڕۆن، دێن و دەر بازە

**

یەکێک دێت تازە یەکێک دەڕفێن
ڕازێکە بۆ کەس دەری ناNوێن
ئەوەی لە گەردوون ئێمە بیزانین
پەیمانە ژینمان هەڵ دەچەرخێن

**

بە هەشت ودۆزەخ خۆ کەس نەی دیوە
کەس ڕووی زەمینی نە پشکنیوە
هیواو بێزاری من لە شتێک دا
ناو ونیشانی خۆی نەزانیوە!

**

ئەوانەی لەکار کەتێ دەکۆشن
خۆڕایی هەموو گای نێر دەدۆشن
وا چاکە بەرگی شێتی بپۆشن
گەر خاوەن هۆشن با ئاو بفرۆشن

**

ئەو شانشینەی بەرزو بڵند بوو
شاهان لەوێ دا دەیان برد کڕنوو
دیم لەسەر بانی کوندە بەبۆیێ
هەڵ نیشتووە دەی کرد کوکو کوکو کوو

**

کە مردین گیانی پاکمان دەبێ دوور
یەک دوو خشت دەکەن بە سەرپۆشی گۆڕ
ئەمجا بۆ گۆڕی کەسانێکی تر،
لە گڵی ئێمە دەکەن خشتی سوور

**

لەسەر ڕووی زەوی نووستوو دەبینم
لە ژێر زەوی دا زیندوو دەبینم
لە چۆڵی نەبوون هەر چەند دەنوارم
نە هاتووەکان و ڕۆییو دەبینم

**

لەسەر قەڵای تووس مەلێک نیشت بوو
کەللەی کاوسی لە چنگ گرت بوو
بە کەللەی دەگوت: حەیف و مخابن
کوا دەنگی زیل و ناڵەی تەپڵی توو؟

**

دوێ شەو بووم لەلای ، وەستای گۆزەگەر
دوو هەزار گۆزە هوشیار باخەبەر
ناکاو گۆزەیێک بە گریان گوتی:
کوانێ گۆزگەر، کڕیار، فرۆشەر؟

**

وەستای گۆزگەر دەی دەی هەڵستە
تاکەی خەریکی بەم بەندو بەستە
پەنجەی فەرەیدوون دەستی کەی خوسرەو
خستۆتە بەر چەرخ تۆ چیت مەبەستە؟

**

دوێنێ لە بازاڕ دیم گۆزە گەرێ
قوڕی دەشێلا ئەم سەر ئەو سەرێ
قوڕ بە زمانی کات گوتی: ئەی وەستا
دوێنێ وەک تۆبووم ئیمڕۆ لێم گەڕێ

**

لە زانست ڕێگای زۆرم بڕیوە
هەموو ڕازێکم چاک پشکنیوە!
ڕۆژ و شەو حەفتاو دوو ساڵ بیرم کرد
ئەمجا تێ گەییم ، چیم نە زانیوە!!

**

ئەو ئەستێرانەی بە ئاسمان بەندن
جێ ی سەرسام بوونی گشت خیرەو مەندن
نەکەی سەر ڕشتەی زانین لە دەست دەی
ئەوانەی زانان نا بەهرەمەندن!

**

هەوا چەند خۆشە وا لەم کاتەوە
نم نم لە گوڵزار گەرد دەشواتەوە
بولبول بە زمانی حاڵ بە گوڵ دەڵێ
هاوارە هەر کەس نەی بخواتەوە!

***

لە بوونم،گەردوون قازانجی چی بوو؟
لە ڕۆیشتنما توانجی چی بوو؟
لە کەسم نەبیست من بەم دوو گوێ یە
لە هات و چۆی من ئامانجی چی بوو؟

**

گێتی کە نامەی جوانی دڕی
بەهاری شادی ژینی لێم کڕی
ئەومەلەی ناوی نرا لاوێنی
هاوار نازانم بۆ کوێ هەڵ فڕی؟

**

کاروانی ژیان دەڕوا بە پەلە،
کاتمان بە خۆشی بەسەربەین هەلە
ساقی چی دەخۆی خەمی بەیانی
مەی بێ، شەو ڕۆیی، خۆر لەسەر کەلە!

**

پێنووسی ئەلەست بەبێ من نووسی
من بێ تاوانم نیمە مەترسی
کە بانگی کردم لە دادگا داوەر
چاکی و خراپیم چی لێ دەپرسی؟

**

کە زوهرەو مانگت لە ئاسمان دیوە
چاکتر لەمەی ناب هیچ کەس نەی دیوە
من سەرسام ماوم لەومەی فرۆشەی
مەی فرۆشت، چاکتر چی پێ کڕیوە؟

**

تاکەی گیرۆدە و دیلی ڕەنگ و بۆی
تاکەی لە شوێنی ناشیرین نیکۆی
گەر چاوەی زەم زەم ئاوی ژیان بێ
لە جەرگەی خاکا گوم دەبی و دەڕۆی

**

من بێ مەیی ناب،تاڵە ژیانم
بێ بەزم وبادە ساتێ ناتوانم
بەندەی کاتێکم کە مەی گێڕ دەڵێ
ئەم جامەش بگرە، منیش ناتوانم!

**

کە مردم بم شۆن بە ئاوی ترێ
چوارمەست و سەرخۆش تەرمم هەڵگرێ
بەهەشت و هیوای غیلمان و حۆری
دڵنیام هەرگیز بەکەس نادرێ

**

ڕاو کەری ئەلەست دانەی خستە داو
نێچیرێکی گرت ئادەمی نا ناو
چاکی و خراپی هەرچی ڕوو دەدا
ئەو دەیکا و ئێمەی پێ دەکا بەد ناو

**

بادە بایی بوون لەسەر دەکا کەم
کلیلە بادە بۆ بەندی مەحکەم
ئەهریمەن جارێک بێ چێشت با لەمەی
هەزار کڕنووشی دەبرد بۆ ئادەم!

**

دەمەو بەیانە گیانە زووکە دەی
بۆم سازکە سازێ، بێنە جامێ مەی
لە هات و چوونی ئەم ڕۆژگارە
نێژراون لە خاک هەزار جەم وکەی!!

**

دەستم با وەک خوا، چەرخی بەد پیشە
دەرم دەهێنای لە ڕەگ و ڕیشە
ئاسمانێکی وام دروست دەکرد
ئازاد لە ژێریا بژبایین هەمیشە!

**

دوێ شەو بە ڕێکەوت چووم بۆ مەیخانە
دیم لەوێ پیری مەست و دێوانە
گوتم: شەرمت بێ، پیر هەڵسا ووتی:
دەرگەی بەخشینی خوا فراوانە!!

**

دوێ شەو دام لەبەرد شووشەو پیاڵە
سەرخۆش و مەست بووم کەوتمە ئەم حاڵە
بە زمانی کاتێ پێ ی گوتم: شووشە
دێییتە ڕیزی من تۆش لەم چەند ساڵە

**

هەڵسە گیانەکەم بامەی بنۆشین
بێ سوودە تاکەی هەر تێ بکۆشین
چەرخی جەفا کار لە ناکاو ڕۆژێ،
ماوەمان نادا نەفەس بکێشین!

**

مەی نۆش کەین لە دڵ زۆر و کەم خەفەت
هەڵ دەگرێ ترسی حەفتا ودوو میللەت
قەت دوو دڵ مەبە، لە نۆشینی مەی
دڵۆپێک دەبا سەد هەزار عیللەت!

**

تاکەی لە مزگەوت بۆ ڕۆژ و نوێژ
وەرە مەیخانە مەست بە گێژ و وێژ
خەیام بنۆشە بادە گڵی تۆ
گەهـ دەیکەین بە جام، گەهـ پیاڵەی لەب ڕێژ

**

بەر لەوەی مەرگ کە هێرش بێنێ
بفەرموو ساقی مەی گوڵ ڕەنگ بێنێ
خۆ نابی بە زێڕ لەناو خاک و گڵ
هەم بت شارتەوە، هەم دەرت بێنێ!

**

دەرگەی رازی مەرگ هەرگیز نەکراوە
نەزان و زانا وەک یەک دا ماوە
من وا دەزانم بچووک وگەورە
پەستن لەو ڕۆژە لە دایکی زاوە!

**

جامی پڕ لە مەی ، سەرمایەی ژینە
باجی وڵاتی چین و ماچینە!!
لەسەر ڕووی زەوی مەی تاڵە تەنیا
نرخی بەرامبەر هەزار شیرینە!!

**

لە منداڵیما بووم بە مامۆستا
گوتم: سەد ئۆخەی گەیشتمە هیوا
بە چی گەیشتم لە ئەنجامی کار
لە خاک دەرهاتم کەوتمە دەم با

**

ڕێ ی کەوتە ناو باخ سەر خۆش بوو بولبول
دی پێکەنینی جام و گەشەی گوڵ
هات بە زمانی کات لەبن گوێم گوتی:
بە شوێن ڕابردوو هەرگیز مەخۆ خول

**

هوشیار بە هەڵسە کۆچ دەکات ژیان
دەچتە ژێر پەردەی نهێنی و نەمان
مەست بە نازانی لە کێوە هاتی
ناش زانی بۆ کوێ دەڕۆی بێ گومان

**

پێم دەڵێن: دۆزەخ جێگای مەستانە
بەهەشت بۆ شێخ و صوفی ریش پانە
گەر مەست و دڵدار جێگای دۆزەخ بێ
بەهەشت چایەرە مۆڵگەی حەیوانە!!

**

پێکی مەی چاکتر لە موڵکی کاوە
لە چین وماچین لە هیندو جاوە
ناڵەی سەر خۆشی هەنگامی سەحەر
لە گوێم وەک زەبوور دەنگی دەداوە

**

هەر زەرە تێکەڵ خاکی زەمین بوو
بەر لەمن وتۆ، تاج و نگین بوو
هەر گەردو خۆڵێ لە ڕێ گوزارێ
دەست وسەرو پای چەند نازەنین بوو!

**

خونچەی پیرۆزبت دەگەشێتەوە
دەستت لە جامی مەی نەکرێتەوە
مەست بە ڕۆژگار دوژمن بە تۆبە
ئیمرۆکە دەڕوا نا گەڕێتەوە!!

**

لەبەر چاوی تۆ جیهان ڕەنگینە
مەنوارە زانا لای نا شیرینە!
زۆر کەس وەکو تۆ هاتن ڕۆیشتن
هەر یەک بەشی خۆی ڕفاند بیبینە!

**

هەر چەند دەتوانی کەس دڵ مەشکێنە
بە ئاگری قین کەس مەسووتێنە!
گەر بەختیاری یەکجاریت دەوێ
خۆت بڕەنجێنە کەس مەڕەنجێنە!

**

من تاوانبارم کوا لێ بووردنت؟
کوا مایەی شادی و دڵ خۆش کردنت؟
بە هەشتم دەیتێ بە نوێژ و ڕۆژ وو
کوا بەخشندەیی داوا کردنت؟

**

لە هەزار لاوە داوی بۆ ناوم
دەڵێت: دەت گرم دەتکەم بەڕاوم
یەک موو دەر ناچی جیهان لە ئەمرت
فەرمان ڕەوام تۆی، بەد ناوت ناوم!

**

لە ڕازی ئەلەست هەردوو داماوین
لە خوێندنی پیتێک نەزان و خاوین
لە پشت پەردەیە گوتەی من تۆ
کە پەردە لاچوو هەردووک نەماوین

**

هیندێک هەر بەلاف لە خۆوون بایی
هیندێک بۆ پەری و بە هەشتی خوایی
دەرکەوت کە پەردە لاچوو لە ڕووی کار
ئەمانە کەوتن دوور لەئاوایی!

**

ئەی دڵ کە گێتی حەز بکا پەست بی
گیانت دەردەکا بێ هەست ونەست بی
بەر لەوەی گیا و گوڵ شین بێ لە خاکت
بە شادی و خۆشی بژی هەر مەست بی

**

بە ڕەنج ئادەمی دەبێتە سەروەر
سەدەف لەقەترە دەبێتە گەوهەر
گەرما لەدەست چوو سەر لە جێ ماوە
پیاڵەی بەتاڵ پڕ دەبێ تا سەر!

**

حەیفم سەرمایەی جوانی لەدەست چوو
بە دەستی ئەجەل جگەر پڕ خوون بوو
کەس نە هاتەوە تا لێ ی بپرسین
حاڵی ئەوانەی ڕۆیشتن چۆن بوو!!

**

گەر ئێمەش نەماین گێتی هەر دەبێ
ناو ونیشانی ئێمە ون دەبێ
بەر لە هاتنمان هیچ نەوەستا بوو
کەئێمەش دەڕۆین چۆن بوو هەر دەبێ

**

من دڵ خۆش نەبووم هێنامتە کایە
لە ژین سەرسامی بۆم بویتە مایە
ڕۆییم دڵگیر بووم نەم زانی چی بوو
لەم هاتوو چوون و بوونی خۆڕایە

**

هێندێک بیر دەکەن لە مەزهەب و دین
هێندێک سەرسامی گومان و یەقین
لە ناکاو دەنگێک هاتە گوێم گوتی:
ئەمانە ڕێگای ڕاستەقینە نین!!

**

گەڕام گەشتم کرد لە دەشت و لەدەر
پشکنیم جیهان هەمووی سەرانسەر
نەم بیست کە هیچ کەس گەڕابێتەوە،
تا ئێستا جارێک مردووی لەمەو بەر

**

پەیکەر جامێکە بە هۆش ڕازاوە
سەد ماچی بەنازلە ڕووی کراوە
ئەم جامی نازک وەستای گۆزەگەر
دروستی کردو لەبەردی داوە!

**

سەرەتای خولی چەرخ زێڕینە
ئەنجامی وێران بوون لە بنچینە
نەزانرا بە بیر بە لێکدانەوە،
چەند لێ ی زانابی هەر نەزانینە

**

ژیانت تاکەی بە خۆ پەرستی
بەسەر برد، لە شوێن نەبوون و هەستی
مەی نۆشکە ژینێک مەرگی لە دوابێ
چاکە بەختی کەی بەخەو، بەمەستی

**

ئەی دڵ زانینی پەنهان تێ ناگەی
بەڕێزی زانا و زیرەکان ناگەی
لەمەی لە عل ڕەنگ بەهەشتێ سازکەین
لەو سەر بە بەهەشت دەگەی یان ناگەی

**

پیرێ تێ پەڕیم لای گۆزەکارێک
دەی نواند هەردەم وێنە و نیگارێک
گڵی باوکم بوو لە ناو دەستی دا
من دیم نای بینێ هەر هەرزەکارێک

**

لە مێشکی گەنم، گەر بم بێ نانێ
گۆزەیەک پڕ مەی گۆشتی مەڕ ڕانێ
لە وێرانەیێک لەگەڵ دولبەرێ
ژینێکە خۆشتر لە ژینی خانێ!!

**

ئاسمان وزەوی چی تێ دا برا؟
یەک یەک بەوردی تەماشاکرا
بۆ هەموو دەردێک دەرمان پەیدا بوو
تەنیا دەردی مەرگ ما چاری نەکرا!!

**

هونەر قازانج و سوودی نەماوە
شێتی، نەزانی، گێلی لەباوە
بۆم بێنە ئەوەی مرۆڤ شێت دەکا
کە بەختەوەری پێوە بەستراوە!!

**

تیشکی خۆر پەنجەی خستە کۆساران
ڕۆژ کشا بەسەر کۆڵانی شاران
بانگ دەر بانگ دەکات دەمی بەیانی
مەی بخۆنەوە هەتا ئێواران!!

**

سەرمایەی زانا نە زێڕ، نەزیوە
ئەوانەی بێ زیو جەرگیان تەزیوە
وە نەوشە سەرکز لەبەر هەژاری
گوڵ شادو ڕووگەش زێڕی بەزیوە

**

کێ بێ لە گێتی نەی کرد بێ تاوان
چۆن ژیا ئەوەی دوور بو لە تاوان
سزای بەد کاریم گەر بەدکاری بێ
گەورەو بچووکی چی ما لە ناوان؟!

**

گوڵ گوتی: جوانتر لەمن کام جوانە
گوڵا وگر بۆچی لێم، دەگری بەهانە؟
بولبول وای فەرموو بە گوڵ، سزات بێ
ڕۆژێک پێکەنین، ساڵێک گریانە!

**

گەر من سەرخۆشی دێری موغانم
گەر من لە ڕیزی بت پەرستانم!
هەر کەس بە جۆرێک لەمن تێ دەگا
منیش هەر ئەوەی کە خۆم دیزانم!!

**

فەلەک کردوونی بە تۆپی یاری
لە ڕووی ڕاستی، نەک هەرزەکاری
یاری گەمان بوو، ئەم سەر زەمینە
بەر لەوەی بڕۆین بەرەو نا دیاری

***

ئەم کەلەشێرەی دەمی بەر بەیان
دەخوێنێ، دەڵێ: هەژاری نەزان
خۆش ڕابوێرە نا گەڕێتەوە،
شەوێکی دیکەش ڕۆیشت لە ژیان!

**

فەلەک نا شادم، لە کارو بارت
دەی ئازادم کە، بەس بێ ئازارت
تۆ کە ئاشنا و دۆستی نا کەسی
منیش کۆسپ نیم لە ڕاگوزارت

**

شێخێک بە ژنێکی دەگوت: نا پاکی
لەبەد ڕەوشتی لە گێتی تاکی
ژن گوتی: یا شێخ چیت فەرموو وایە
ئەتۆش ڕاست بڵێ پیاوێکی چاکی

**

ئەم زانایانەی موو دەقەڵێشن،
دەربارەی زاتی خو ادوور ئەندێشن
دەرگەی ئەم ڕازە بۆ کەس نەکراوە
نە براوە ئێستاش لە کێشمە کێشن!!

**

لە خـۆت بپرسـە گـەر زانا و وردی
هاتی چیت هێنا؟ چیت برد کـە مردی؟
لە ترسی مـردن مـەی ناخـۆیتـەوە
بخـۆی یان نە خـۆی کـە مردی مردی!!
**
من قـەت خـووم نە گـرت بە نوێژ و ڕۆژوو
گـەردی تاوانم پاک نەکـرد لە ڕوو
هیـوا بڕاو نیم لە بارەگـای تۆ،
تۆم بەیەک زانی هەرگیـز نەم گـوت دوو
**
بۆیە مـەی ناخـۆم ببمـە لۆتی ولات
دژی خـوو ڕەوشت ئـاژاوەی ولات
بۆ هـەوڵ دەدەم، مـەست وبێ هۆش بم
ڕۆژێک بێ خـەم بم دوور لە کـارەسـات
**
فـەرمـووتان کـە من شـایانی سـزام
لـەم چاوە ڕاوە بـۆیە نە تـرسـام
شـوێنێک تـۆی لێ بێ سـزا کـوا لەوێ
جێ یەک تـۆی لێ نی نـەدراوە ئەنجـام
**

لە مـزگـەوت، لە دێر، مـوسـڵمـان، تەرسـا
بـە هەشـتی دەوێ، لـە دۆزەخ تـرسـا
کـەسـێک شـارەزای نهـێنی خـوا بێ
تـۆی وا نـا چێنـێ لە دڵ هـیچ کـەسـا
**
گـیـان فـیـدای کـەسێک خـاوەن هونەرە
سـەر خسـتنە ژێر پێی وەک تاجی سـەرە
حـەز دەکـەی دۆزەخ بـزانـی چـی یە؟
دۆزەخ دۆسـتی کـەم هـەست بەد فـەڕە!!
**
ژیـان وتـەمـەن بـێ پـەروا دەڕوا
زارو خـەمبـار و بێ هیـوا دەڕوا
لـەدرێـژی ژیـان شـادیم نـە دیـووە
حـەیفم بـۆ ژینێـک دەڕوا وا دەڕوا
**
لـەگـەڵ پیـرێکدا هـاتینـە دووان
پرسـیم دەنگـو بـاس لـە ڕابـردووان
پێکـەنی گـوتی: زۆری وەک ئێـمـە
هـاتـن، ڕۆیـشتن، بـە دوومـردووان
**

شکاندنت شووشەی ڕەنگ ئەرخەوانی
بەستت لێم هەموو ڕێ ی شادمانی
من هەرچی دەی کەم مەست و سەرخۆشم
لە من مەستتر تۆی، ئایا دەزانی؟

**

من کە بەد ناوم بەمەی گوساری
کەوتمە بەر ڕەخنەو بەر لۆمەکاری
هەموو تاوانێ گەر پێ ی مەست دەبووین
هەرگیز نەدەما کەس بە هوشیاری

**

بخۆوە دەچیە ژێرخاک و زەوی
بێ یارو یاوەر لەوێ دەخەوی
ئەم ڕازە لای کەس ئاشکرا نەکەی
گوڵێک کە سیس بوو چۆن دەپشکوی

**

گیانە با بەمەی خۆمان دڵشاد کەین
بەس لە نەهاتوو، ڕابردوو یادکەین
با گیانی پاکی ناو زیندانی خەم
دەمێک لە بەندی زانین ئازاد کەین

**

کە شادیی و خۆشی دروست کرد خودا
بۆ ئەو کەسە بوو کە تەنیا دەژیا
کاتێ لە تاکی کە خۆی کرد بە جووت
ژینی ئارامی خۆی خستە بەر با

**

ڕۆژ نیاز دەکەم شەو دەکەم تۆبە
لە مەی لە ساقی جامی جەم تۆبە
ئێستاکە فەسڵی گوڵ هات بێ باکم
تۆبە بێ تۆبە چۆن دەکەم تۆبە!!

**

مردم فرێم دەن لە کوچەی شارێک
بەرد بارانم کەن، وەک تاوانبارێک
گڵم دوو بارە بە قوڕ بشێلن،
بیکەن بە شووشەی دەست مەی گوسارێک

**

شادی مەخوازە تەمەن دەمێکە
هەر خشتی دیوار کەللەی جەمێکە
ژیان، دڵخۆشی چەرخ و ڕۆژگار
خەو و خەیاڵ و هەورو تەمێکە!!

**

ڕاسپاردەم بێ ئەو ڕۆژەی مردم
مەرگ نەمامی ژینی هەڵکەندم
لە گڵم پیاڵەی شەڕاب دروست کەن
زیندوو دەبمەوە پێ بەهرەمەندم!!

**

ئەوەندە کە تۆ دەخۆی، دەنۆشی
دروستە هەر چەند بۆ تێ دەکۆشی
لەوە زیاتر هۆشت بێ، بۆچی
ژینی بە نرخت هەرزان دەفرۆشی؟

**

گیان کە هاتەلات دابەزی لە خاک
میوانی تۆیە دڵگیر و خەمناک
ڕیزی لێ بگرە هاکا هەڵفڕی
دەگەڕێتەوە ناو عالەمی پاک

**

هەڵسە بۆم لێ دە عودو نەی و چەنگ
ساقی بۆم بێنە پیاڵەی گوڵ ڕەنگ
بەرماڵی نوێژم بۆ مەی دەفرۆشم
دەشکێنم بەبەرد شووشەی نام ونەنگ

**

مردووی گۆڕستان بوون بە تۆزو گەرد
با بردی پەرت بوو، لە ڕووی دەشت وهەرد
ئای لەو شەرابە هەر کەس کە نۆشی
بێ هەست بێ ئاگا لە هەر گەرم و سەرد

**

دەمەو بەیانی گوڵ بە ئاشکرا
بەسەرهاتی خۆی باس کرد بۆ سەبا
لە ماوەی دە ڕۆژ چەرخی ستەمکار
خونچەی کرد بە گوڵ گوڵی دا بە با

**

ئای بۆ ئەو دڵەی بێ سۆزوتینە
خاڵی لە سەودا و میهرو ئەڤینە
بەسەر بردنی ڕۆژێک بێ بادە
کارێکی دیژوار زۆر دڵ تەزێنە

**

ڕەنگ و ڕووی گێتی نەخشی سەرئاوە
گەر وای تێ نەگەی خەیاڵت خاوە
دانیشە شاد بە نۆشکە جامێ مەی
خۆت دوور ڕابگرە لەم بەندو باوە!

**

یاران ئەو دەمەی کە کۆڕ دەگێڕن
بە شادی و خۆشی ئاهەنگ دەگێڕن
لەیادم نەکەن، گیانم شاد دەبێ
کە جار جار بەخێر دوعا بنێرن!

**

لەو ڕۆژە خاکم بە قوڕ شێلدرا
لەگەڵ دەردو خەم لە قاڵب کرا
توانام نەبوو شتێک بگۆڕم
هەر لەیەکەم ڕۆژ وا دروست کرا

**

بگرە گوێ پەندم بیکە بە پیشە
مەست و دڵ خۆش و شاد بە هەمیشە
سەیری یاریگەی ڕۆژگار بکە
لە گۆشەیەکدا ئارام دانیشە!

**

تەمەن و ژیان بێ پەروا دەڕوا
زارو خەفەتبار بێ هیوا دەڕوا
بەدرێژی ژیان شادیم نەدیوە
حەیفم بۆ ژینێک دەڕوا وا دەڕوا

**

خوتی خاوەنی مردن و ژیان
مانگ و ئەستێرە و زەوی و ئاسمان
منیش بەندەی تۆم هەر چەند بەدکارم
وات دروست کردم من نیمە تاوان!!

*******

# مەتەڵ

(١)

ئاوێکی شیرین زۆر سازگارە
ناوەستێ دەڕواو ڕوو بەرەو خوارە
لەشەش پیت پێک دێت ناوی تەواوی
دەکرێ بە سێ لەت، چاوەو دەراوی
چوار وپێنج و شەش شارێکە بە ناو
لە کوردستانی ژوو رووی بەش کراو
سێ و چوار و شەش ئێستا زۆر کەمە
بە برنجی کوردی نەی خۆن ستەمە
یەک و دوو سێ خواردنی دەرمانە
مارلێ ی ڕادەکا بۆ گیانی ژانە
یەک و چوار وسێ ڕەنگێکی باوە
دەکرێ بە تارا بۆ بووک وزاوا
یەک ودوو و چوار هەم سوور هەم زەردە
قوبەی سەر سینەی کچێکی کوردە
دوو وپێنج و سێ زۆرم خۆش دەوێ
گەر ڕۆژی جەژنی نەورۆز دەرکەوێ!
شەش و پێنج و سێ ترش و شیرین بێ
لە شارەبان بێ یا نازەنین بێ
بە بیرو زانست مەتەڵ هەڵێنە
بە هێزی بازوو بەرات بستێنە!!
**وەڵام (سیروان)**

(٢)

ناوی شارێکە گەورەو کورد نشین
گەر ئەم حەوت پیتە بەڕیز بنووسین
یەک وسێ و دوو لەگەڵ شەشەمین
ڕیزی لێ دەگرن بە دین و بێ دین
یەک و دوو چوار پەرستشگایە،
ئەگەر ڕووی تێکەی عەینی خەتایە
یەک و سێ و حەوت لە لادێ و لە شار
قەڵاچۆی دەکەن بە تەورو مشار!
شەشەم و سێ یەم بی دەن بە یەکا
دەی کڕی ئەوەی پێویست بێ بەکا
پێنج و شەش و حەوت زۆرت مەرامە،
ناوی پیاوێکی گەورەی ئیسلامە!
پێنج و چوار وسێ برا برایە،
مەتەڵ نەزانی هووچەت بڕایە
**وەڵام (دیار بەکر)**

(٣)

مەتەڵ حەوت پیتی کرد بە نیشانە
ناوی شارێکە لە کوردستانە
پیتی پێنج و حەوت، بە سووک و ئاسان
کارێکە و بویتە پیشەی ناکەسان
چوار و شەش و یەک دوو وحەفت هەموو
ڕۆژێکی خۆشە لەلای من وتو
حەوت و سێ و یەک بەبێ بیر کردن
دەشێ بۆ چاکە و خراپە کردن!!
یەک وسێ و حەوت، بە پێچەوانە،
ئاشکرای نەکەی کارێکی جوانە
پێنج و شەش و یەک، دوو بێتە بانی
بە کەسێک دەڵێن دژی ئینسانی
پێنج و یەک و سێ لەگەڵ شەشەمین
هەموو کەس هەوڵی بۆ ئەدا لە ژین
یەک و سێ دوو خۆشە بە سواری
ئەگەر بیزانی بۆت دێنم دیاری
**وەڵام (رواندوز)**

(٤)

کێویکی بڵند بەقەد هەڵگوردە
نیشانەی بەرزیی نەتەوەی کوردە
لە پێنج پیت پێک دێت ناوێ بۆ وێنە
جێ ی نەوەی میدیای ئاشوور شکێنە
یەک دوو و چوار بۆ ئەو کەسانە
دژ و نەیارن لەم نیشتمانە
چوار و دوو پێنج بەشی هەژارە
بێنج و چوار و سێ زۆرە لەم شارە!
سێ و دوو و چوار ڕەنگی شەڕابە
هەڵی گێڕەوە سەگ و سەگبابە!!
مەتەڵ هەڵێنی بە ژیر و وردی
قبووڵی بخۆ بە برنجی کوردی
**وەڵام (کۆسرەت)**

(٥)

ولاتێکی خۆش ناو هەشت پیتە
زانایان دەڵێن یەکجار بەپیتە
یەک و شەش و حەوت و هەشت لەسەر یارە
ئەوەی بیکرێ بۆ کراسی یارە
پێنج ودوو شەش لەگەڵ حەوت و هەشت
لێ ی ڕزگار دەبین کە چووین بۆ بە هەشت

پێنج و دوو، حەوت و سێ بە ئاسانی
سوار بە بە کوردی ئەگەر بیزانی
پێنج و دوو سێ سوور دیارە
هەڵی گێڕەوە لە دین بێزارە!
چوار وسێ و حەوت دووی بخەرەبان
زۆری خۆش دەوێ مرۆڤ لە ژیان
چوار ویەک شەش، دوو وسێ گشتیان
وەکو پزیشکە بۆ داوو دەرمان!
چوار و حەوت وپێنج بۆ خەلەوخەرمان
ئەگەر ئەو نەبێ ناگرم سەپان!
شەش و حەوت و پێنج جێگای سەر ڕاسە
بێ خەم و دەردو پەژارە و تاسە!
بیر بکەرەوە ئەگەر بیزانی
دڵسۆزی کوردی لە کوردستانی !!

**وەلام(کوردستان)**

(٦)

شەش پیت ژمارەی دێ یەکی کۆکە
باریکی نیسک تایەکی نۆکە
پێنج و دوو وشەش سێ ی بخەرە سەر
حەز دەکەی بلێ یونس پێغەمبەر
شەش و دوو چوار بۆت بێت بە شادی
لێ ی خۆشتر نی یە مەگەر ئازادی
سێ و پێنج و دوو هەم سوور هەم زەردە
جەمعی ئەو بارە تاکی ئەم فەردە!!
چوار ودوو پێنجیش دووجار تەواوە
شارێکی کۆنی کوردی بە ناوە!
مەتەڵ هەڵێنی بە گۆڕی حاجی
پێشکەشت دەکەم هەموو باواجی

**وەلام(بۆسکێن)**

(٧)

شارۆچکە یەکی تازە دانراو
لە پێنج پیت پێک دێ ناوی ئەو تەواو
یەک و چوار و دوو لە ژێر کەوانە
لە دوور و نزیک نرخی یەکسانە
دوو چوار و پێنج شارێکی بەناو
هەڵی گێڕەوە زوو دێتە بەر چاو
سێ و چوار و یەک ڕۆژانی لاوی
مەزەی شەرابە دوور لەبەد ناوی
سێ و چوار و دوو زۆر ئاشکرایە،
ناوی پیاوێکی گەورەی دونیایە!

مـــــەتەڵ هەڵێنی بەســـەری شــێـــخی
کــــەبابی دەخـــۆین لە گـــۆشـــتی بەرخی!!
وەڵام(چۆمان)

(٨)

دێ یەکم بینی لە دەشـــــتــــــێکی پان
شـــــەش پیت بوو ناوی ڕۆژێک لە ڕۆژان
زســـتـــــان وەک مـــاسی جێ ی لە ژێر ئاوە
هـــاویـن دەبـیـنـی نـیـــــوە خـنـکـاوە
سێ و پێنج و شـــەش جـــێگای لەبانە
چوار و پێنج و شــــەش زۆر بۆحـــــەیوانە
دوو و پــێـــنـج و چـوار چــست و بـە بـازە
گـــازت لێ بگرێ کـــارت نا ســـازە!!
یـەک و سێ و چوار کــــــاری زیندووە
لـە دوا دوایـی دا خـــــانەی مـــــردووە
یەک وچواروپێنج لەگـــەڵ شـــەشـــەمین
زۆر جـــــار دراوە بـە ڕۆن و هـەنـگـوین
یـەک و دوو چوار لـەســـــەر گــــەردانی
نا حـــەســێـــتـــەوە تا مـــابێ گـــیـانی
یەک و چوار دوو جـــار ئاوازی قـــەلـە
بەخـــێـــر بگەڕێ بۆمـــان ئەم هەلە!

(٩)

شــــوێنێکی دڵ گـــر زۆر باســـەفـــایە
جــــێگای تەجللای دیداری خـــوایە
بە تـەمــــــەن پـیـــــرە، بە دیمەن لاوە
ڕیش ســـپی، ســـەری ڕەشی بێ کــڵاوە
لەشـــەش پیت پێک دێ شـــۆرەت و ناوی
دەکـــــــــــەوتـە یادی ڕۆژانـــی لاوی
یـــــەک و دوو و ســـێ بـــەدارە دارە
چوار وپـێـنج و شـــەش لەژین بێـــزارە!
چوار و دوو سێ خـــاوەن فـــەرمـــان بوو
مـــیـری مـــیـری بوو لە کـــوردســـتـان بوو!!
دوو وپـێـــنج و سێ ســــــەر لە بەیانی
دەم بە پـێـکـەنین لە ڕێگـای کـــــانی
شــــەش و پێنج و سێ وەک زوڵفی یارە
مـــەگـــەر پاسداری گـــەنمی ڕوخســـارە!
سێ ودوو وپێنج کـــاری ناکــــەســـە
دوور بن لە پیـــاوی بەدرۆ و دەلـەســـــە!!
وەڵام(پیرمام)

( ١٠ )

پڕ لە شوێنەوار کۆگای دەستکردە
شارێکی کۆن و دێرینی کوردە
هەموو پێنج پیتە بێ زیاد و کەم
بە ئەبجەد دەکات سەدو بیست سێ کەم
دوو پیتی پێشی بخەرە لاوە
ناوی ئاوازێک ئەوەی کە ماوە!
سێ پیتی دوایی بە پێچەوانە،
ناوی شارێکی کۆنی کوردانە
یەک و چوار و پێنج لەگەڵ سێ یەمین
گەر ئەومان نەبێ زستان چۆن دەژین
سێ و پێنج و چوار بۆ عام و خاسی
گەر هەڵی گرین کەس کەس نا ناسی
مەتەڵ تەلیسمە گەر بیشکێنی،
گرەوی هونەر بۆ خۆت دەرفێنی!!

**وەڵام(نینوا)**

# تاکە شیعر

کردەوەی چاکت ئەگەر بوو بێ لە مەرگ ترست نەبێ
ئەو کەسانەی کردەوەی چاکیان بووە قەت نامرن!

**

کەس نی یە لە جیهان کە دڵگیر نەبێ
مەگەر ئەو کەسەی شێت بێ ژیر نەبێ

**

من لەگەڵ هێزو توانام دەست لە ئەژنۆ ناگرم
خاوەنی مافی ڕەوامە دەستی لێ هەڵ ناگرم

**

شیعرەکانم وەک شعورم کرد بڵاو،
ئێستە چەند ڕاویان دەکەم ناکەونەداو!

**

ماوەیەک پشت گوێ خرابوو تیخی ژەنگاوی خەیاڵ
بۆ جەلا ئێستاکە سەقڵ و مشتو ماڵێکی دەوێ

**

من بە ئاواتم لە لووتکەی کێوی هیوا سەرکەوم
پێ ی شکاندم ڕۆژگار، هەرگیز خەیاڵی وا نەکەی

**

گەر هەموو تاوانێ وەک مەی ئادەمی سەرخۆش دەکرد
لەم جیهانە نەت دیت تەنیا کەسێ سە رخۆش نەبێ!!

**

دولبەری شۆخم لەگەڵ من خوایە مەیلی کەم نەبێ
شادمان و بەختەوەر بێ، تووشی دەردو خەم نەبێ

**

نیگارم عیشوە بازو سەرکەش وبێ ڕەحم و بێ دینە
لەلای ئەو خوێن ڕژاندن، بەدخوبی ئاداب و ئایینە!

**

ئافەرین بۆ ئەو گوڵەی گوڵ یاد دەکا
ئەو گوڵەی درێژەی ژیان دڵ شاد دەکا

**

بێوەژن بۆشوو مەیلی هەر ماوە
کوێر هەتا دەمرێ بە تەمای چاوە

**

هەر کەسێکی هەلی بۆ هەڵ کەوت، کەوتە هەڵە
بێ گومان مافی ژیانی نی یە دەمرێ بە پەلە

**

ئەوەی بۆ دوژمن کە سەر شۆڕ ناکا،
جێگای زۆر بەرزە لە ژوور ئەفلاکا!!

**

گەر ئارام بگری نەبی تەنگە تاو،
پەسیرەی ترش دەکەی بە دۆشاو!!

**

ئەگەردولبەربەچاوی مەستی خۆیناتوانێ من مەست کا
بەڵێن بێ تاکو ماوم هۆگری ویسکی و شەڕاب نابم!!

**

تف لەوەی نانی هەیە مەیلی بەدو دوونان دەکا
تف لەوەی خوانی هەیە خولیایی بەزمی خان دەکا

**

کۆمەڵەی مافی مرۆڤ و دادگای دادی گەلان
بۆگەلان سوودیان نی یە تەنیا کە هۆی دەردو بەڵان

**

موغەننی دەی ماقامێ بێژە بەیتێکی کەماڵی بێ
لەزەت زۆرتر دەگەیەنی گەر ماڵی بێ جەماڵی بێ

**

پیاوە خێرەو مەند و هونەر پیشەکان
لازمە بۆ وان هەبێ دوو جار ژیان
جاری یێکەم تەجروبەی پێ وەرگرن
جاری دووەم تاکو نەبینن زیان!!
**ئەم چوارینەی لە فارسییەوە کردووە بە کوردی**

**

# هەڵبژاردە

ملوانکەیێکی لە هەڵبەستی جوان
بۆی دەهۆنمەوە وێنەی مرواری

بە کێشان سووک بێ، بە نرخ گران
پێشکەشی دەکەم بە ناوی دیاری!

کە کوردیە ملی گەردانەی هونەر
وەک لەعلی سوورە، شین وەک پیرۆزە

زۆر بە نرختر، لە دانەی گەوهەر
ئەوە جەژنانەی جەژنی نەورۆزە

***

# دیاریی لاوێک

ماوەیەکی زۆر بوو دانیشتوانی شارەکە چاوەڕوانی هاتنی کاروان بوون، چونکە لە ڕۆژگاری پێشوودا هەموو شتێک و پێویستی یەکی دیکە، لە شارێکەوە بۆ شارێکی تر بە هۆی کاروانەوە دەگواسترانەوە، بەڵام ماویەکی زۆر بوو کاروان نەهاتبوو، شتومەک و پێویستی لە بازاڕدا زۆر کەم بوو بوو، دانیشتوانی شارەکە چاوەڕوانی هاتنی کاروان بوون، ڕۆژێک دەنگ بڵاوبووەوە کاروان گەیشت، خەڵکەکە زۆر دڵخۆش بوون. بەڵێ کاروان گەیشت، شتوومەک گواسترایەوە بۆ کۆگاو دوکانەکان، ئەو ڕۆژە ڕۆیشت، ڕۆژی دوایی کۆگاو دوکانەکان کرانەوە، کڕین و فرۆشتن دەست پێ کرا، هەر کەس پێویستی خۆی دەکڕی و بەرەو ماڵ دەکەڕایەوە، تەنیا کوڕێکی لاونەبێ، کە هیچی نەکڕی بوو، سەری بەهەموو کۆگا و دوکانەکاندا دەکرد، زۆر بە وردی سەرنجی دەدا، یەکێک لە خاوەن کۆگا و دوکانەکان ڕووی کردە کوڕە لاوەکەو پێ ی گوت: «ئەی کوڕی لاو وا دیارە بە شوێن پێویستی یەکی تایبەتی کەوتووی و لێ ی دەگەڕێیت و نای دۆزی یەوە» لاوەکە لەوەڵامدا گوتی: «بەڵێ کاکی بازرگان پێویستیم بە شتێک هەیە و بە شوێنی دا دەگەڕێم بەڵام نای دۆزمەوە و تەنیا هەر بۆ ئەو عەودالم» بازرگانەکە ڕووی کردە لاوەکە و پێی گووت: «ئەی کوڕی لاو ئەوەی بە دوای دا دەگەڕێ ی و دەتەوێ بیکڕی پێم بڵێ چی یە؟». لاوەکە گوتی: «ملوانکەیەکە شایانی دیاری بێت بۆ خۆشەویستەکەم، تا بتوانم بە دڵنیایی لە گەردەنی بکەم!» بازرگانەکە پێ ی گوت: «ئەی کوڕی لاو ئەوەی ئەتۆ بە دوای دا دەگەڕێ ی لای من چنگ دەکەوێ! بەڵام بۆیە نای خەمە پێش چاوان چونکە نرخی یەگجار گرانەو هەموو کەس ناتوانێ بیکڕێت!!»

لاوەکە گوتی: «من ئامادەم بە هەموو نرخێک بیکڕم و بۆم بێنە تەماشای بکەم.» بازرگان هەستا سندوقێکی هێناو سەری هەڵدایەوە ملوانکەیەکی دەرهێنا و دایە دەست لاوەکە و پێ ی گوت: «وا بزانم ئەوەی کە دەتەوێ بیکڕی ئەوەیە!» لاوەکە ملوانکەکەی وەرگرت و تەماشای کرد، ملوانکەکە بریتی بوو لە چەند دانە گەوهەرێک لەسەر هەر گەوهەری پیتێک نووسرابوو، هەموو پیتەکان ئەم دێڕە نووسینە بوو «بە هۆی {٠} ئازادی، رزگاری، بەختیاری دەست دەکەوێ!»

لاوەکە گوتی: «کاکی بازرگان لەم نووسینە هیچ تێ ناگەم وا دیارە ئەم ملوانکەیە دانە گەوهەرێکی لێ کەم کرابێتەوە، چونکە نووسینەکە بێ ئەنجام دەمێنێتەو و ئەتۆ نازانی ئەوگەوهەرەی کە لە گەردانەکەدا جێگای چۆڵە چی لەسەر نووسراوە؟» بازرگانەکە گوتی «ئەی لاو من نازانم کەم و کووڕی گەردانەکە چی یە؟ من هەروەهام کڕیوە و هەروەهاش دەی فرۆشم و زۆر کەس

له پێش تۆدا کڕیویانه و بۆ خۆشەویستەکانیان بردووە!» لاوەکە گوتی: «زۆر باشە ئەمە نرخی چەندە؟» بازرگان گوتی: «جارێ نرخەکەیت لێ وەر ناگرم، فەرموو ئەوە ملوانکەکە بیبە ئەگەر خۆشەویستەکەت بە دڵی بوو، ئەو پێت دەڵێ: نرخی چەندە؟ هەر کاتێ گەڕایەوە بۆ ئێرە پارەکەم بۆ بێنە، خۆ ئەگەرلێ ی وەر نەگرتی ئەو کاتە گەردانەکەم بۆ بێنەوە.» لاوەکە گوتی: «لێت وەرناگرم هەتا نرخی ملوانکەکەت پێ نەدەم!» بازرگان گوتی: «ئەی لاو لە ڕاستی دا منیش نرخی نازانم، بەڵام بڕواییم بە تۆ هەیە، فەرموو ئەمە ملوانکەکەو، لێرە بەرەو باشوور گۆڕستانێک هەیە ،ئەگەر بچی بۆ ئەوێ ئافرەتێک دەبینی لێ ی بپرسە، ئەو دەزانێ نرخی ملوانکەکە چەندە؟». لاوەکە ملوانکەکەی وەرگرت و بەرەو گۆڕستان ڕۆیشت تاگەیشتە ئەوێ و دیتی ئافرەتێک لەسەرگۆڕێک دەگریەو فرمێسکی خوێنین دەبارێنێ بۆ جگەر گۆشە جوانە مەرگەکەی. لاوەکە بە دیتنی ئافرەتەکە سەرسام بوو، بێ دەنگ بەرامبەری ڕاوەستاو ماوەیەکی زۆر تەماشای کرد، تا ئافرەتەکە سەری بڵند کردو ڕووی تێ کرد و پێ ی گوت: « ئەی کوڕی لاو لەم گۆڕستانە چ کارێکت هەیەو بە شوێن چی دا دەگەڕێ ی؟» لاوەکە گوتی: «دایکی بەڕێز ملوانکەیەکم کڕیوە بۆ خۆشەویستەکەم، دەمەوێ بە دیاری بۆی ببەم بەڵام خاوەن ملوانکەکە نرخەکەی لێ وەر نەگرتووم و پێ ی گوتووم بیبە بۆ گۆڕستان لەوێ پێت دەڵێن نرخی چەندە؟ منیش هاتووم لێت بپرسم نرخی ملوانکەکە چەندە؟» ئافرەتەکە پێ ی گوت: «کوا ملوانکەکە؟» لاوەکە دەستی خستە گیرفانی و بۆی دەرهێنا، ئافرەتەکە تەماشای ملوانکەکەی کردو ڕووی کردە لاوەکە و پێی گووت: «ئەی لاو تۆ ناتوانی بگەی بە خۆشەویستەکەت و ئەوملوانکەیەی لە گەردنی بکەیت! چونکە ئەم ملوانکەیە گەوهەرێکی کەمە و هەتا ئەم گەوهەرە لە شوێنی خۆی دانەنرێ، ملوانکەکە بە ناتەواوی دەمێنێتەوە و نووسینی گەوهەرەکانی دیکە هیچ واتایەکی وا نابەخشێ کە پی ی دڵنیابی و ئەتۆش بە ئاوات ناگەی و هەروەکو ئەوانەی لە پێش تۆدا هاتن و بەئاوات نەگەیشتن! ئەی لاو تەماشای ئەم گۆڕستانە بکە، کە پێ ی دەڵێن گۆڕستانی گیان بەختکەران، هەموویان لاوی گیان فیدا کارو ودلێر بوون، لێرەدا گیانی خۆیان بەخت کردو ، هیچ کامێکیان نەیان توانی دیاری یەکانیان ببەن بۆ خۆشەویستەکانیان و بەئاوات بگەن!» دەستی درێژ کردو لە باخەڵی چەند دانە ملوانکەیەکی دەرهێنا وگوتی: «ئەی لاو خاوەنی ئەم ملوانکانە وەکو تۆ بۆ خۆشەویستەکانیان دڵسۆز بوون، چونکە ئەم ملوانکەیە وەکو گوتمان دانەیەکی کەمە، هەتا ئەم دانەیە پەیدا نەکرێت و لە شوێن خۆی دا دانەنرێ نووسینی ملوانکەکە هیچ واتایەک نابەخشێ و کەس لێ ی تێ ناگات و هەر کەسێ بتوانێ ئەم دانەیە دەست خۆی بخات و لەناوی دا داینێ ئەوا ملوانکەکە تەواو دەبێ و دەتوانی لە ملی خۆشەویستەکەتی بکەی!» لاوەکە گوتی: ئەی دایکی بەڕێز! ئەگەر هاتوو ئەم گەوهەرە پەیدا کراو لە شوێن خۆی ڕیزکرا، نووسینی سەر ملوانکەکە چۆن دەخوێنرێتەوە؟» ئافرەتەکە گوتی: «ئەو دانە گەوهەرە لەسەری نوسراوە

(یەکیەتی). ئەوکاتە هەموو گەوهەرەکان بەڕیز بهۆندرینەوە نووسینەکە بەم جۆرە دەخوێنرێتەوە: «بەیەکیەتی، ئازادی و رزگاری و بەختیاری دەست دەکەوێ!»

ئەی لاو تەماشاکە ئەوانەی لەم گۆڕستانەی خۆ بەختکەران گیانی خۆیان سپاردووەو نە گەیشتوون بە ئاوات!» لاوەکە گوتی: «ئەی دایکی بەڕێز دەبێ ئەو گەوهەرەی ملوانکەکەی پێ تەواو دەبێ هەر پەیدای بکەم تا بتوانم لە گەردەنی خۆشەویستەکەمی بکەم! ئەی دایکی بەڕێز ئەم گەوهەرە لە کوێ دەست دەکەوێ؟ بەڵێن بێت من بەهەر نرخێک بێت بیکڕم!»

ئافرەتەکە گوتی: «ئەی کوڕی لاو، ئەو بازرگانەی ئەم گەوهەرەی لا دەست دەکەوێ، ناتوانێ بۆ ئەم دەورو بەرە بێت، چونکە لەو بازرگانانە دەترسێ کە ئەم ملوانکانە دەفرۆشن و بازرگانی پێوە دەکەن! کەوشەی بریقەداری وەکو ئازادی و رزگاری و بەختیاری لەسەر نووسراوە و لە بەرژەوەندیی ئەم بازرگانانە نی یە، ئەو بازرگانەی گەوهەری (یەکیەتی) لەلا دەست دەکەوێ، بێت بۆ ئەم دەورو بەرە، چونکە دەبێتە هۆی سست بوونی بازاڕ و کەم بوونی دەست کەوت و ئاشکرا بوونی درۆ ودەلەسە و خیانەتکاری یەکانیان. ئێستاش ئەی کوڕی لاو، گوێ لە ئامۆژگاریی دایکی خۆت بگرە و هەر ئێستا بگەڕێوە بۆ لای دایکت و باوکە پیر و هەژارەکەت چونکە زۆرت پێوە ماندوو بوون و ڕەنجیان پێتەوە کێشاوە و بە خۆڕایی جگەر سووتاویان مەکە و گیانی خۆت بێ هوودە لەدەست مەدە. لاوەکە گوتی: «ئەی دایکی بەڕێز و جگەر سووتاو، زۆرسوپاست دەکەم، بەڵام بەڵێن بێ نە گەڕێمەوە تا بە ئامانج دەگەم و گەوهەری (یەکیەتی) وەدەست دێنم!

لەگەڵ ئەو لاوانەی کە کڕیاری ملوانکەن بۆ خۆشەویستەکانیان دەبێ بەهەر نرخێ بێت پەیدای بکەین و لە ملی خۆشەویستەکانمانی بکەین! ئای چەندە بە نرخە یەکیەتی چونکە ئازادی و رزگاری و بەختیاریمان پێ دەست دەکەوێ. ئافرەتەکە ڕووی تێ کردو پێ ی گوت؟ «ئەی لاوبە هیوای گەیشتن بە ئامانج برۆ خوات لەگەڵ بێ!!»

# عەونی شاعیری هەڵکەوتوو، هیوا ڕوون

عبدالرزاق بێمار

ڕۆژی ٢٠ تەمموز مامۆستا عوسمان عەونی دوا ماڵئاوایی لێ کردین وەکو ئەستێرەیەکی گەشی ئاسمانی ئەدەبیاتی کورد ناوی لە دەفتەری نەمراندا جێگیر بوو.
عەونی شاعیرێکی هەڵکەوتوو بەهرەدارو کۆششکار بوو. سەرەڕای ئەوەش تەمەنی ٧٨ ساڵەی(١٩١٤ ـ ١٩٩٢) گەنجینەیەکی داخراوی ئەدەب وهەڵبەستی شاعیران وکەلەپووری میللی کوردو قسەو هەواڵ وسەرگوزشتەی مەجلیسان ونموونەی ئەدەبیاتی فارس ومێژووی کوردو یادگارو بەسەرهاتی ساڵانی خەبات وکارەسات وتەنگو چەڵەمەکانی وڵات بوو.
شاعیرێکی هەڵکەوتوو بوو. چونکە لە سەرەتای لاوی لەپڕ کانیاوی شیعری تەقییەوەو لە دنیای شیعرو شاعیراندا دەنگی خۆی چەسپاند. سەرەتا دەسمایەی ڕۆشنبیرییەکی زۆری نەبوو کە هاتە کۆڕەکەو ئەزموونێکی زۆریشی نەبوو لە کاری هەڵبەست وئەدەبیات، بەڵام شیعرەکانی وەکو نموونەی غەزەلیاتی سەردەم بە بەستەو مەقام دەگوتران وزۆر شیعری بەسەر زاری خەڵکی کۆیەو دەوروبەرییەوە بوو. بۆ شاعیرێکی لاو ئەوەندە بەسە کە صافی هیرانی(١٨٧٦ ـ ١٩٤١) شێخی ناوداری تەریقەت وشاعیری بەرزی تەصەووف شیعرێکی ئەم بکا بە پێنج خشتەکی. هەروەها (دڵدار)ی ڕۆشنبیرو شاعیرو سیاسی لە یادداشتی خۆیدا بەوپەڕی ڕێز باسی عەونی بکات ولە بۆنەیەکیشدا پێکەوە شیعرێک بهۆننەوە.
نەجمەدین مەلا چەند غەزەلێکی عەونی لە کەشکۆڵێکدا نووسیوەتەوەو وای بۆ چووە ئەم عەونییە شاعیرێکی کۆنی سەدەی ڕابردووە. ئەگەر چی وەکو دەڵێن عەونییەکی تر لە سەدەی نۆزدەهەمدا هەبووە، بەڵام ئەم شیعرانەی نەجمەدین مەلا نووسیوویەوە دەق ئەوانە بوون کە عەونی کۆیی دایناون ولە دیوانی ئەودا هەن، ئەمەش بەڵگەی پلەو پایەی شاعیریی عەونی لاوە.
لە ڕاستیدا سەرەتاو سەرهەڵدانی شیعری شاعیر دیاردەیەکی سەرنج ڕاکێش وجێی تێڕامانە، چونکە هەر لەو تەمەنەدا غەزەلیاتی عەونی لە شێوەو ڕوخسارو ناوەڕۆکدا هیچی وای لەبەر غەزەلی کۆنی شاعیرانی ناسراودا نەبوو، کەوا لە کێش ومۆسیقادا بە ئاهەنگ ولە دارشتندا لێ هاتوو بێ گرێ وڕەوان بوون ولە زمانی ڕۆژانەی خەڵکەوە نزیک بوون وبۆ ئاوازی بەستەو مەقامی گۆرانی بێژان زۆر چاک دەسازان. ئەگەر چی هەر لە چوارچێوەی غەزەلی کۆنیشدا بێت تامو بۆیەکی هاوچەرخیان پێ درابوو.. لەم کۆڕەدا ئەم غەزەلانەی عەونی زۆر بەناوبانگ بوون:

**هات فەسڵی گوڵان بولبولی دێوانە لە کێیە؟**
**شەو ڕۆیی، ئەدی عاشقی پەروانە لە کێیە؟**
**موتریب بە فیدات بم ڕەهی مەیخانە لە کێیە؟**

هەروەها:

**وەکو قومری لە باغ وجۆیباران**
**دەناڵێنم لە چڵ فەسڵی بەهاران**

**له بۆ سەروی قەدی شاهی نیگاران**
**بە دیمەن بێ کەس ورووت هەتیوم**
**لەژێر بای غەمت من چۆن چەمیوم**
**وەکو پیرێکی سەد ساڵە رزیوم**
**لە گەنجی چوومە ریزی دەست بەداران**

***

عەونی لە شیعردا نەک هەر لە کۆربەستنی سەرهەڵدان ورادەی شیاوی شیعرە سەرەتاکانیدا دەردەکەوێ، بەڵکو لە بەردەوامیی شاعیرییەت وتێکەڵ بوونی بە رۆژگارو دانەبڕانی لە کاروانی راپەڕیوی شیعری کوردی ونوێ بوونەوەی وپۆشتە بوونەوەی بە ناوەرۆکی هاوچەرخانیشدا.

ئەگەر چی لە ماوەی نیو سەد شیعر نووسیندا بەرهەمێکی زۆری نییە، بەڵام بەڵگەیەکی بەهرەداری ئەوەیە لەو ماوەیەدا کانیی شیعری وشک نەبوەتەوەو لە کات وسەردەمی پێویستدا وەک برووسکە شیری شیعری لە چەخماخەی داوەو تێکەڵ بە کاروباری میللەت بووە.

لە ساڵانی چلەکاندا لەو رۆژانەدا کە شەپۆلی تێژو رۆیی کوردایەتی لە بەرزیدا بوو. شیعرەکانی عەونی نموونەی شیعری خەبات وبەربەرەکانی بوو. بەتایبەتی ئەم شیعرەی زۆر بەناوبانگە کە دەڵێ:

**ئەسلەحەی جەنگی دەبەستم باسی کوردستان دەکەم**
**قەتڵ وعامی تورکەکان وغارەتی ئێران دەکەم.**
**چونکە ئەو دوو قەومی زاڵم خوێنی کوردیان زۆر رژاند**
**دوژمنی خاک و وڵاتم پەرت وسەرگەردان دەکەم**

لە دواییدا دەڵێ:

خزمە گوێ بگرن لە بەندە(عەونی) زۆر بێ چارەیە من گرینم نەک لە بۆ خۆم بەڵکو بۆ کوردان دەکەم.

ساڵی ١٩٤٨ لە رۆژانی راپەڕینی گەلی عێراق دژی کار بەدەستانی کۆنە پەرست وپەیمانی پۆرتسموث لە رۆژانی بە(وەثبە) ناسراودا، عەونی یەکێک بوو لە شاعیر خوتبەخوێنانی کۆڕو کۆبوونەوە جەماوەرییەکان ودەربارەی یەکیەتیی نیشتمانی دەیگوت:

**عەرەب وکوردو مەسیحی وجوو**
**گشتی یەک زمان، یەک بیرو یەک روو**
**گشتی یەک زمان وا هاوار دەکەن**
**لەعنەت لە چارەی ئیستعمار دەکەن**

لە چواردەی تەمووزی ١٩٥٨ وساڵانی کۆماریدا دەنگی دیار بوو لە شۆڕشەکانی کوردو دەردو مەینەتیەکانی گەلدا بەردەوام بوو لە هۆنینەوەی شیعرو لە حەفتاکان وهەشتاکانیشدا هەر بەردەوام بوو.. چەند نموونەیەکی سەرکەوتووشی لە گۆڤاری(بەیان) و(کاروان)دا بڵاو کردەوە.

جگە لەوە کە عەونی شاعیرێکی هەڵکەوتوو بەهرەدار بوو. شاعیرێکی کۆششکار بوو. مەبەستیشم لە کۆششکار ئەوەیە کە شاعیر نەهات لەسەر ئەو چەندە بەهرەو ئاورەنگەی هەیەتی کڕ لێی بکەوێت وپاڵ بداتەوە. بەڵکو هەمیشە خەریکی خۆ رۆشنبیرکردن ودانەبڕان بووە لە کاروانی شیعردا.

سەرەتا ئەگەر لە قوتابخانەی نالی و وەفایی دەرچوو. پاشان تێکەڵ بوو بە رێبازی شیعری حاجی قادرو بێ کەس وئەثیری دوایی سەیری هەوڵ وکۆششی کوردانەی پیرەمێردو رێچکەی ژینی کردو شاگەشکەی شۆڕشی نوێیی گۆران بوو، سەرسامی زمان

وداڕشتنی شیعری هەژارو هێمن بوو.. لەمانە گشت وردبووەوەو لێی کۆڵیەوەو لێی وەرگرتن وهاوڕێیەتی کاروانی بەرەو پێش چووی شیعری پێ کردن. ئەگەر عەونی شاعیرێکی کۆششکار نەبووایە لە شوێنی خۆی دەمەیی ولە کاروان بەجێ دەما.

***

عەونی لە تەمەنی شیعریدا بۆ دڵداری وکوردایەتی وخەباتی مرۆڤایەتی لە پێناوی ئازادی وئاسایش ودادی کۆمەڵایەتیدا شیعری نووسیوە. دەنگی شاعیر هەمیشە دەنگی هاندان وهیوا بەرز کردنەوەو بە گوڕخستنی ڕەنج وتێکۆشانە ودەنگی سەرومڕییە لەگەڵ کاروانی ڕووەو بەیانی وخۆرهەڵات. هەروەها بۆ خەباتی فەلەستین وڤیێتنام وگەلان ڕاپەڕیوی دژی ئیمپریالیزم شیعری گوتووە. ئەوەتا ساڵی ١٩٨٧ لە گۆڤاری کاروانی ژمارە(٥٧)دا بە بڕواوە دەربارەی خەباتی گەلان دەڵێ:

**خەیاڵی بووکی شادی بۆ دڵی پەستم زەماوەندە**
**دەنەیژەن لێدەنەی با چۆپی بڕوا چەند گەڕێکی تر.**
**دەبا دەهاکی بەدخوو خوێن بڕێژێ تاکو ڕۆژی دێ**

دەکەوتێــمە بەر شەپۆلی هەڵمەتی ئاسنگەری تر لە جویم دەنگی زرنگا پێی گوتم(عەونی) بە هیوابە

ئەمە چەرخە دەسووڕێ دێتەوە دەوروبەرێکی تر، لەو چەند نموونەیەی لەم ساڵانەی دواییەدا بڵاوی کردۆتەوە. شێوەی هەڵبەستی عەونی بریتییە لە هەڵچنینی بابەتێکی سەربەخۆو ئەنجام لێ دەرهێنانی وکردن بە(ڕەمز)، ڕەمزەکەش داخراوو پۆشراو نییە.

بە نموونە لە هەڵبەستی(خونچە گوڵێک)ی ژمارە(١٢٥)ی گۆڤاری(بەیان)دا، کێشەو بەربەرەکانی لەنێوان خونچە گوڵێک وبولبولێک دەکا بە بابەتی شیعرەکە، بەڵام مەسەلە باوەکەی دڵداری نێوان گوڵ وبولبول بە جۆرێک هەڵدەگێڕێتەوە کە خونچە گوڵی باخی کوردەواری نایەوێ خۆ بەدەستەوە بدات هەر بولبولێک بۆی بخوێنێ لێوی خۆی بۆ ناکاتەوەو بە بولبول دەڵێ:

**گوتی: بولبول هەرزەکاری**
**لێت بوویتە خوو، شین وزاری**
**هەردەم لەسەر لقێ چڵی**
**هەر ڕۆژ بەرامبەر بە گوڵی**
**زۆر خۆت دەکەی ماندوو شەقی**
**چڵێک لەژێر پێت دەچەقی**
**من تا ئێستا پارێزراوم**
**چڵی خۆمە دەوری داوم**
**نە ئەتۆو نە باغەوانی پیر**
**ناتوانن بمکەن دەستەگیر**
**خونچە باخی کوردەواریم**
**بەراتی موژدەی ڕزگاریم**

هەر بەم جۆرەش لە هەڵبەستی(ڕەنج دەکێشم) کە لە ژمارە(٦٦)ی گۆڤاری کارواندا بڵاو کراوەتەوە وتوویژ لەگەڵ کەمانچە ژەنێک دەکا بە بابەتی شیعرەکەو دەڵێ:

ئەی کەمانژەن لێدە ئاوازی نەوا
**بیژە ڕاست تا دێیتە سەر شۆرو سەبا**
**هەروەها پێی دەڵێ: من بێ ئارامم ودڵم پڕ دەردە**
**لە ململانێی چەرخی چەپگەرددا بەردەوامم چونکە:**
**ئاشنا نابین لەگەڵ یەک چونکە من**

**نابمە هەم سایەی ئەوانەی بێ خەمن**
**رەنج دەکێشم، تێ دەکۆشم ورۆژ وشەو**
**تا بە دەست دەینم هەموو مەرجی گرەو**
**ئەو دەمە زۆر سەرفرازو بەختیار**
**دەچمە ریزی چینی داماو وهەژار**

هەر چەندە شاعیر خۆی بە جۆرێک بە کەمانژەن دەناسێنێ کە رێگەی راستی گرتووەو هیوای بەرزە، بەلاّم رووی تێ دەکا:

**ئەی کەمانژەن بیرکەوە واهات بەیان**
**شەو بەسەر چوو چیت نەکرد بۆمان بەیان**
**پێی گوتم(عەونی) وەرە ئێستا برۆ**
**زۆر نەماوە دێیتەوە سەر گفتوگۆ**

هەر بەم شێوەیەش لە شیعری(گەشتی مانگە شەو)دا باسی رێبوارێک دەکا کە ئاوارەو سەرگەردان چیاو دۆڵ وکۆهسارو بنار دەبڕێ بەلّکو بگاتە(قۆناغ):

**تا ماندوو بووم لە پێ کەوتم**
**هەورازێک بوو، سەرنەکەوتم**
**لەو کاتەدا مانگ ئاوا بوو**
**رێگەی کورتم لێ کۆتا بوو.**

ئەم(بابەت)ە دەکاتە رەمزی تێکۆشان وئەنجامەکەشی بەهیوا دادەخات.

**دەبێ چاو لە رێی کاروان بم**
**گوێ گری بانگی بەیان بم**

*   *   *

**کۆنگرەی یەکێتی نووسەرانی کورد لقی هەولێر**
**١٩٧١/١/١٥**

لەراستەوە بۆ چەپ:
طاهر احمد حوێزی، عشمان عەونی، مام هەژار،
شێخ محمد هەرسینی، جلال غریب، عثمان مصطفی خۆشناو

**هاوینەهەاری بێخاڵ ساڵی ۱۹٦۰**

له راستەوه بۆ چەپ:

١- مامۆستا یەحیا خەڵکی دهۆک
٢- احمد دلزار(شاعیر) کۆیە ۱۹۲۰
٣- عبداللە گۆران(شاعیر) هەڵەبجە ١٩٠٤
٤- محمدی ملا کریم(نووسەر) سلێمانی
٥- عثمان عونی حبیب(شاعیر) کۆیە۱۹۱۸

**هاوینەهەواری شەقلاوە**

لە راستەوە بۆ چەپ:
مامۆستا یحیی، عەونی، گۆران، محمد ملا کریم، دلزار
**١٩٦٠/٨/١٨**

**بارەگای رۆژنامەی (التاخی) بەغداد**

چاوپێکەوتنێکی رۆژنامەنووسی لەگەڵ جلالی میرزا کریم لە بارەگای رۆژنامەی (التاخی)

**بەندیخانەی(نوگرە سلەلمان) ساڵی ١٩٦٣**

لە ڕاستەوە بۆ چەپ:
کامەران موکری، عەونی

# سوپاس و پیزانین

له کانگای دڵەوە سوپاسی ئەو دۆست و هەڤاڵانە دەکەم کە له ماوەی ئەو چوار ساڵەدا یارمەتییاندام بۆ ئامادەکردنی «دیوانی عەونی» چ بە زانیاری دەربارەی هەندێ لە شیعرەکانی چ بە دۆزینەوەی هەندێ لە شعرە وونبووەکان یان بە رێنمایی کردنیان دەربارەی چۆنیەتی چاپکردنی ئەم دیوانە.

هەروەها ئەو هاوکارییەی هەڤاڵی خوشەویست کاک شەوکەت شێخ یەزدین ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی «پ.د.ک»و وەزیری دارایی کابینەی سێیەمی حکومەتی هەرێمی کوردستان هەرگیز لە بیرناکەم کە ئەرکی لە چاپدانی «دیوانی عەونی» لە ئەستۆی خۆی گرت، جارێکی دیکەش سوپاس بۆ هەموولایەک.

**فەرهاد عەونی**
**١٩٩٧/٣/٢٥ ـ هەولێر**

## سەرنج

عەونی شاعیری نەتەوەیی کوردمان لە پێشەوەی ئەو شاعیرانە بووە کە بەبۆنەی گەڕانەوەی سەرۆک بارزانیی نەمرەوە لەیەکێتی سۆڤیەت لە رۆژی ١٩٥٨/١٠/٦دا بۆ وڵات، شیعری داناوەو بە جوانترین شێوە پێشوازی لێکردووە.

بەوبۆنەیەوە شاعیر ئەم هۆنراوەیەی لەژمارە «٣٥»ی رۆژی ١٩٥٨/١١/٢٢ی رۆژنامەی **(پێشکەوتن)** دا بڵاوکردۆتەوە. ئێمەش لەکاتی ئامادەکردنی دەستنووسی ئەم دیوانەدا لەساڵی ١٩٩٢ ئەم هۆنراوەیەمان لەبەردەستدا نەبوو تاکو بیخەینە ناو دوو توێی دەست نووسەکەوە و دواتر لەژمارە «١٨١٤»ی رۆژی ١٩٩٣/١٢/٦ی رۆژنامەی **(برایەتی)**دا چنگمان کەوت و والێرەدا دەقەکەی بڵاودەکەینەوە و داوای لێبووردنیش لە خوێنەری بەڕێز دەکەین.

# نامەیەک بۆ بارزان

ئەی سروەی شەماڵ، کزەی بەر بەیان
فیدات بم هەڵسە، بڕۆ بێ وچان
نامەی گوشادی کوردو کوردستان
هەڵگرە بیبە بۆ شاخی بارزان
بڵێ مژدە بێ ئەی کێوی سەربەرز
دێنەوە وڵات شێرانی نەبەز
رۆڵەی ئازادین، هاوڕێی دڵسۆزن
خەمخواری گەل و خاکی پیرۆزن
ئەوان رابەری گشت تیرەو هۆزن
بانگدەری مژدەی جەژنی نەورۆزن
بڵێ موژدەبێ، موژدەی یەکجاری
گەل رزگار ئەبێ لەدەست زۆرداری
بڵێ مژدەبێ بەسەر چوو گریان
بەسەر چوو رۆژی شین و قوڕ پێوان
بەسەرچوو بۆ گەل کەلەپچەو زیندان
ئاسایش خوازی بکرێ بەتاوان

کاروانی گەلان لەرێی ئازادی
دێتە گوێ دەنگی زەنگۆڕێ شادی

ئەوجا بای شەماڵ لەوێوە بڕۆ
بۆ دهۆک، ئاکرێ، ئامێدی، زاخۆ
بۆ مووسڵ، ژەنگار، دیاربەکر، شنۆ
بۆ سنەو سابلاخ، سلێمانی، کۆ

بەسەر کەرکووک و هەولێر راببرە
گوێ لەئاوازی ئازادی بگرە

ئەوجا بای شەماڵ رۆیشت گەڕاوە
گەشتێکی وایکرد لەهەموو لاوە
لەشار، لەلادێ، لەم لا، لەولاوە
هەرچی بیستبووی بۆمی گێڕاوە

ئەڵێ هەر کوردە وەک شێری ژیان
سوێند ئەخوا بە کورد خاکی کوردستان

لەمەولا ئەبێ هەر تێکۆشەر بین
بەوێنەی تیرو شیرو خەنجەر بین
هەڵبڕی ئاسک و گیانی تێکدەر بین
کوشندەی هەموو چینی شەڕکەر بین

هەر بەتێکۆشان بەهەوڵ وخەبات
گەل ئازاد ئەبێ ئەگات بەئاوات

سوێند بەو دارە بێ لەبن قووت کرا
سوێند بەو بەردە بێ بەخوێن سوورکرا
سوێند بەو دایکە بێ کە جەرگی بڕا
سوێند بەو باوکە بێ کە رۆڵەی کوژرا

سوێند بەسێدارەو بەخوێنی گەش بێ
سوێند بەوڵاتی کوردی بەش بەش بێ

کۆڵ نادەین ئێمە هەرگیز ناوەستین
زۆر زۆر لەمێژە لەدوژمن پەستین
خاوەنی هۆش و زانین و هەستین
ئەبێ یەک بیرو یەک دەنگ و هەست بین

ئێمەش ئێستاکە ئازادی خوازین
بۆ گشت گەلان و بۆ کورد دەخوازین

کوردیش خاوەنی نیشتیمانێکە
لەمێژووی گەلان قارەمانێکە
بیری یەکێتی کوردستانێکە
تایبەتی خاوەن کە داستانێکە

بۆ کورد سەربەستی و سەربەخۆیەتی
مافی خۆیەتی مافی خۆیەتی

